# ئامراز

# لە زمانی کوردیدا



دوکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

# ARTICLES IN KURDISH LANGUAGE

DR·E·AZIZ EBRAHIM






ناوی کتێب : ئامراز لە زمانی کوردیدا

نووسەر : دوکتور ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

بڵاوکەرەوە : ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

( انتشارات صلاح الدین ایوبی )

تیراژ : ۳۰۰۰

چاپی یەکەم : ۱۳۶۷

نەخشینەری رووبەرگ : مستەفا قازی

پێشەکی :

بابەتی ئامراز تا ئێستا نەبۆتەباسێکی سەربەخۆ ، وەهیچ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەکتێبخانەی کوردیدا دەربارەی نابینرێت . ئەوەی لەم رووەوە بەرچاو دەکەوێت چەند کورتە باسکردنێکە . ئەم کورتەباسانەش وەنەبێ هەموو ئامرازەکانی گرتبێتەوە ، بەڵکە یەکێ یان دووان یان زیاتر لەو ئامرازانەی گرتۆتەوە ، ئەوەش لە کتێبە رێزمانیەکانی رێزمان نووسانی کورد،یان غەیریکورد دەبینرێت . تەنانەت من لە ئامرازی سینتاکسی یەوە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیم لە قەوارەی کتێبکدا بڵاو کردۆتەوە ولەساڵی ١٩٨٠ چاپکراوە بەناوی هەندێ ئامرازی سینتاکسی لەزمانی کوردیدا . هەروا لێرەشدا وردبوونەوەیەک لەچەند ئامرازی زمانی کوردی دەخەمەپێش چاوی خوێندەوارانی بەرێز بۆئەوەی ئەم بابەتە لەقالبێکی تایبەتی و وردبوونەوەیەکی تایبەتی دا لای، خوێندەوارانمان ئاشکرا ببێت . هەروا بۆئەوەش کەئامرازە-کانی زمانی کوردی باسێکی تایبەت بەخۆیەوە بگرێتەبەر .

ئەم باسەم ئامرازەکانی خوارەوە دەخاتەپێش چاو :

١- ئـامـرازی بانگ کردن

٢- ئـامـرازی پـرسیـار

٣- ئـامـرازی سـەرسوڕمـان

٤- ئـامرازی نـاسـراوی ونـەنـاسـراوی

٥- ئـامـرازی کـۆ

٦- ئـامـرازی فـرمـانـی

٧- ئـامـرازی پـەیـوەنـدی

٨- ئـامـرازی خـۆزی

٩- ئـامـرازی نـەفـی - نـەرێ

١٠- ئـامرازی پلـەی بـەراووردوباڵ

١١- ئـامرازی داواکـردن وپاڕانـەوە

بۆئەم ورد بوونەوەیەش چەند سەرچاوەیەکم بینیـون ولـە لاپەڕەی سـەرچـاوەکان پێشانـم داون.

## بەشی یەکەم

ئامرازی بانگکردن

لەزمانی ئەدەبی ئەمڕۆی کوردیدا ئامرازی بانگکردن ئەمانەی خوارەوەن :

ئەی ، هۆ ، هێ، یا ، ۆ ، ە ، ێ ،

١- ئەی:

ئەم ئامرازی بانگکردنە لەلایەن گشت رێزمانووسانی کوردەوە باسکراوە وبەئامرازی بانگکردنیان دانــاوە . زۆر بەئاشکرا بەکار دەهێنرێت بۆبانگکردن لەزمانی کوردیدا و لەهەردوو دیالێکتە بنچینەیەکانی زمانی کوردیدا هەیە .

ئەم ئامرازە بۆبانگکردنی (کەس) چ نێر وچ مێ، هەروەها بەکار دەهێنرێت بۆ بانگکردنی کۆمەڵێک وەک لەنموونەکانی خوارەوەدا دیارە :

- ئەی هاوولاتیانی خۆشەویست !

١- ئەی جەماوەری گەلی کوردمان یەکگرن.

٢- ئەی قوتابیانی دڵسۆز بخوێنن.

٣- ئەی خوشک وبرایانی خۆشەویست .

ئەم ئامرازە بەکار دێت هەرچەندە رستەش لەئارادا نەبێ ونەشکەوتبێتە ناو رستەوە

ئەی کرێکارانی ماسولکەپۆلابی

ئەی دلێران

ئەی جووتیاران

ئامرازی ( ئەی ) لەگەڵ رستەش بەکار دێت وخۆی دەنوێنێت ، بەنموونە :

ئەی خەباتگێران رێگای خەبات بگرنەبەر

ئەی خوێندکارانی کورد بەگەرمی بخوێنن.

ئامرازی بانگکردنی ( ئەی ) بۆ بانگکردنی شتیش بەکاردێت وەک داواکردن وبانگکردنی نیشتمان ، هەر وەک لەشێعری کوردیدا هاتووە .

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم وشێوەتم بیرکەوتەوە

ئامرازی (ئەی) هەردەم دەکەوێتە پێشەوەی رستەبان بانگکراو . بەهیچ جۆرێک ناتوانێ بکەوێتەناوەوە یان، دواوەی بانگکراو بەنموونە :

ئەی کاکەی شوان یەجکار دەروون ڕووخاڵم
چاوەڕێی دەنگێکی بەرزی شمشاڵم

٢- ئامرازی بانگکردنی ( هۆ )

ئەم ئامرازە لەزمانی کوردیدا چ لەزمانی ئەدەبی یان ئاخافتندا بۆ بانگ بەکاردێت ، بۆنموونە :

هۆبرام !

هۆکاکە!

هۆخاڵە!

ئامرازی (هۆ) بەس لەگەڵ ناوی نێر بەکار دێت بۆ نموونە :

هۆشوان !

هۆئاسۆ !

هەروەها دەتوانی لەگەل ناوی گشتی (کۆ) ش بەکاربێت .

بۆنموونە :

هۆبراینە !

هۆخزمینە !

هۆکچینە !

لەدەربڕینەکانی سەرەوەدا ووشەکانی ( براییـنە ، خزمینـە کچینـە ) نـاوی گشتـی (کۆ ) ن . کەلەواندا ئـامـرازی ( ان) بۆتە "ین" : کچان بۆتەکچینە وخزمان بۆتە خـزمیـنە دەشتوانێ لەگەڵ هەندێ وشەی ناوی گشتیـدا پیتی ( ا ) لـە ئامرازی (آن) بمێنێتەوە بەڵام ئەمخاسیەتـەکـەم بەکاردێت

٣- ئامرازی بانگـکـردنـی (هـێ)

ئەمە ئامرازێکی کەم بەکار هاتووە لـەزمـانـی کـوردیدا وهەرلەگەڵ نـاوی ( مێ) یینە بـەکار دێـت بـەنموونـە :

هـێ رەوشـەن !

هـێ نازەنیـن !

هـێ پـەرویـن !

زۆرجار کەئامرازی بانگـکردنـی (هـێ) دەچێتـە سەرناوەکـە پیتی (ی) وەردەگـرێت بـەنموونـە :

هـێ خـەجێ !

هـێ گوڵشەنێ !

ئامرازی (هـێ) لەگەڵ ناوی گشتی تاکی مێینە بەکاردێـت .

بەنموونە :

هێ دایە !

هێ ژنێ !

ئامرازی بانگکردنی (یا ):

ئەم ئامرازە لەزمانی کوردیدا هەیە چ لەزمانی ئاخافتن یان ئەدەبیدا ، بەڵام لەبنچینەدا کوردی نیە ولە عەرەبی یەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردی ، لەم زمانەدا بەزۆری لەگەڵ ناوی پیرۆز بەکار دێت وەکوو : خوا ، پێغەمبەر ، محەمەد ، بەنموونە :

یا خوا !

یا محمد !

ئامرازی بانگکردنی (ۆ ) : ئامرازێکی کوردی یە

کوڕۆ وەرە

عەزۆ بڕۆ!

ئەمئامرازەلەزمانی کوردیدا کەم بەکاردێت ، بەکار هێنانی لەدیالێکتی سەروو زۆرترەلەهی خواروو .

ئامرازی ناوبراو هەر لەگەڵ ناوی نێر بەکار دێتو

ناچێتە سەرناوی مێ.

میرۆ! هەفاڵۆ!

ئامرازی بانگکردنی (ە):

ئەمەشیان یەکێکە لەئامرازەکانی بانگکردنی زمانی کوردی ، بەکارهاتنی لەم زمانەدا ئاشکرایە بۆنموونە:

کوڕە وەرە!

خاڵە برۆ!

کاکەبچۆ!

ئامرازی (ە) تایبەتە بەناوی نێرەوە، وەهەر لەگەڵ ناوی نێر بەکاردێت

بابە

برایە

خزمە

ئامرازی (ە)دەچێتە سەرناوی گشتی کۆ. لەم حالەتەدا ، "ان" کەنشانەی کۆیەدەبێتە "ین"

کوڕینە

خزمینە

کەسینە

براینە

ئەم ئامرازە بۆناوی گشتی (کۆ) (نێرومێ) بەکاردێت ئامرازی (ە) دەتوانێ بچێتە سەرناوی کۆی مێینە. بە نموونە:

کچینە!

خوشکینە!

ئامرازی بانگکردنی (ێ):

ئەم ئامرازە لەزمانی کوردیدا بەکاردێت وئاشکرایەبە نموونە:

پووری!

خوشکێ!

کچێ!

ئامرازی (ێ) بانگکردن لەزمانی کوردیدا هەرلەگەڵ ناوی (مێ) بەکاردێت، ناوەکە (چ) گشتی بێت یان ناوێکی تایبەتی بێت.

## بەشی دووەم

## ئامرازەکانی پرسیار

لەزمانی کوردیدا ئامراز هەیەتایبەتە بەپرسیارەوە ،ئەمانە کۆمەڵەئامرازێکن لەم زمانەدا پرسیار دروست ئەکەن، لەمانەی خوارەوە :

بۆ ، چ، بۆچ، بۆچی، چۆن، ئایا ، کەی، چەند ، چی، کێ، کامە کوا ، لەبەرچی ، کوێ ( لەکوێ، بۆکوێ، تاکوێ).

ئامرازی (بۆ):

لەنووسین وقسەکردندا بەکار دەبردرێ و"هۆی" شتێک دەپرسێ: ئەمئامرازە دەتوانێ رستەی پرسیار دروست بکات بەنموونە :

بۆکتێبەکەت نەخوێندۆتەوە ؟

ئامرازی (بۆ) دەتوانی بکەوێتە پێش فرمانەوەبەنموونە :

بۆهاتوویەئێرە ؟

بۆنەهاتیەئێرە ؟

ئامرازی (بۆ) دەکەوێتە پێش ئەووشەیەی کەمەبەستمانە بیزانین لەرستەدا بۆنموونە :

بۆدوێنێ دیار نەبوویت ؟

لەرستەی سەرەوەدا مەبەستمانە بزانین دیاربوون لە

دوێنێدا ، لەبەر ئەوە ئامرازی (بۆ)ی کەوتۆتەپێش.

ئامرازی (بۆ ) دەکەوێتە پێش ناوی پرساو . وەکوو:

بۆدوێنێ نەهاتی؟

لێرەدا ئامرازی (بۆ ) کەوتۆتەپێش وشەی دوێنێ کەمەبەستە بزانین نەهاتن لە دوێنێدا .

ئامرازی (چ ):

ئەم ئامرازە بۆپرسینی بەرکار (مفعول) لەغەیری ئینساندا بەکار دەبردرێ، وەک : چ دەنووسی؟

لێرەدا مەبەست زانینی ئەوشتەیە کەدەنووسرێ؟ لەوەڵامدا دەڵێین :

نامەدەنووسم

ئامرازی (چ ) لەناو رستەدا بۆدەست نیشانکردن یان بۆ هەڵبژاردن بەکار دێن . بەنموونە :

چ کەس ؟ چ شت ؟

ئامرازی (چ ) کەدەکەوێتە پێش ناوێک ناوەکە ئامرازی نەناساوی یەک وەرئەگرێت . واتە ( یەک ) وەرئەگرێت .

چ کتێبێک ؟ چ کەسێک ؟

ئامرازی (چ) دەکەوێتە پێش فرمانیش . بەنموونە :

چ دەکەی؟ چ دەخۆی؟

ئەگەر هات وئامرازی پرسیار (چ) لەگەڵ فرمانی تێپەڕ هات لەکاتی رابردوودا راناوی لکاو وەردەگرێت چونکە ئەبێتە بەرکاری یەکسەر ،بۆنموونە :

چمکرد؟، چتکرد؟ چی کرد؟، چیمان کرد؟، چیتان کرد ؟

ئامرازی (بۆچ):

ئەم ئامرازە لەرووی دروستبوونەوە ئامرازێکی لەزمانی کوردیدا دروست بکات وهەمان مانای "بۆ" دەدا :

بۆچ منت ناوێ ؟

بۆمنت ناوێ ؟

ئامرازی بۆچی :

ئامرازێکی لێکدراوە لە ( بۆ + چی ) پێکهاتووە ،ئەمئامرازەش دەتوانێ رستەی پرسیار دروست بکات وهەمان مانای " بۆ " دەدا .

بۆچی نەگریم سەدکەرەتم دڵ دەشکێنی ؟

"بۆچی" هەروەها بەمانای بۆچ شتێک یاچ مەبەستێک بەکار

دەبردرێ وەک :

بۆچی دەڕوانی ؟ یانی لەچ شتێک دەگەڕێیی ؟ بۆچی هەوڵ ئەدەی ؟ یانی بۆچ مەبەستێک تێدەکۆشی ؟

ئامرازی چۆن :

ئامرازێکی پرسیارە ، کەچلۆنایەتی وچۆنەتی کار ، یا حاڵ وئەحواڵ دەپرسێ ؟ چۆن فێری کوردی بم؟ کاکە چۆنی؟ چۆن دەچیە سەرکار؟

ئازاد چۆن هات ؟

ئامرازی ئایا :

دەکەوێتەپێش رستە ودەیکاتە پرسیار ، وەک :

پەروین هاتەئێرە .

ئایا پەروین هاتەئێرە؟

ئامرازی کەی :

ئەم ئامرازە کاتوزەمان دەپرسێ : وەک

کەی سەرداتێکمان دەکەیت ؟

کەی چویتە تاران ؟

ئامرازی چەند :

ئەم ئامرازە، ژمارە دەپرسێ وهەمیشە دەکەوێتەپێش ئەو ناوەی کەژمارەی پرسیار کراوە وەک :

ئەمساڵ چەند کتێبت خوێندۆتەوە؟

چەند برات هەیە؟

لەرستەکەدا دیارە چەند دەتوانێ بکەوێتە ناو رستەوە،بەلاَم هەردەمدەکەوێتەپێش و شەی پرس کراوەوە.

ئامرازی کێ:

بۆپرسینی فاعیل یا بەرکار ( مفعول) لەئینساندا بەکاری دەبەن وەک :

کێ یارمەتیمان دەدا؟ هیوا یارمەتیمان دەدا (فاعل)

کێ بانگ دەکەی؟ هیوا بانگ دەکەم (مفعول)

ئامرازی کامە :

(کام) ئامرازی پرسیارە بۆهەڵبژاردن ودەستنیشان کردن

کامە (کام) چیرۆکت بەدڵە؟

کام کڵاوت دەوێ؟

ئامرازی کوا :

ئەم ئامرازە شوێن وجێگە دەپرسێ

کوا خوێندکارەکان ؟

کوا ماڵەکانتان ؟

## بەشی سێ هەم

## ئامرازەکانی سەرسوڕمان

لەزمانی کوردیدا ئەم ئامرازانەی خوارەوە بۆ سەرسوڕمان بەکار دێت :

هەیها ، پەکوو ، پەکوف ، حەک ، هەک ،پێح، پەحا ،( تەح،تەحە تەحا )، ئەک ، هەو ، چش، ( وای، ئای، ئۆخەی) ،ئاخ ئۆف ، بەه بەه .

١- هەیها لەوکردەوە نابەجێیە !

٢- پەک لەوقسە خۆشە !

٣- پەکولەوهەوایەناخۆشە !

٤- هەک لەم وتەجوانە !

٥- پەح لەوهەواساردە !

تێبینی:

ئامرازەکانی سەرسوڕمان ( پەح،پێح،پیح) ئەمانەهەرسیکیان یەک روالەتیان هەیە بەلام جیاوازی یەکی فۆنەتیکی لە نێوان هەر سێ ئامرازەکەدا هەیە . سێ ئامرازی سەرسوڕمانی تر هەیە (تەح، تەحە ، تەحا ) ئەمانەش لە روالەتا یەکن بەلام جیاوازی یەکی فۆنەتیکی لەنێوانیاندا هەیە ،ئامرازی

تەح یان تەحا لەنموونەی خوارەوەدا دیارە:

تەح لەوقسەبەجێیە!

جاری وا هەیە ئامرازی تەح دەکەوێتە دوای رستەبەنموونە:

دوێنی کتێبێکی ٥٠٠ لاپەڕەییم خوێندەوە، تەح لەوقسەیە!

نموونە بۆ ئامرازی (وای):

وای لەوکچەجوانە!

دیسان (ئای):

ئای لەوبەلایە!

لەبەرهێنانی ئامرازەکانی سەرسوڕمان فۆڕمی (لەو) بەکار دێت ودەکەوێتە دوای ئامراز،بەڵام هەندێ ئامراز هەیەوەک (وای، ئای، وەی وەی) ئەمانەئەتوانن لەسەرەتای رستەش بێن. وفۆڕمی (لەو) وەرناگرن، هەروەها هەندی جار فۆرمی (لەو) وەردەگرن.

ئامرازی تری سەرسوڕمان دەتوانێ لەکۆتاییوشەشدا بێت (تەح، چش، پێح).

## بەشی چوارەم

### ئامرازەکانی ناسراوی ونەناسراوی

لەزمانی کوردیدا کۆمەڵێک ئامرازهەیە دەچنە سەر ناو دەیکەنە ناسراو یانەناسراو .

| | | | |
|---|---|---|---|
| خوێندکار | ەکە | خوێندکارەکە | ناسراو |
| 〃 | ێک | خوێندکارێک | نەناسراو |

ئامرازەکانی ئێرە بریتین لە ( کە ، ەکە ، ێک ، دک ، یەک ێ ).

ئامرازی کە :

ئامرازێکی ناسراوە تایبەتەبەو ناوانە کەکۆتاییان بە پیتی بزوێن هاتووە ، هەروەک لەنموونەکانی خوارەوەدا دەر دەکەوێ:

| | | |
|---|---|---|
| چیا | چیاکە ، دەریا | دەریاکە |
| هەرمێ | هەرمێ کە ، پەنجەرە | پەنجەرەکە |

تێبینی:

ئەگەرهاتووناوی"هەبی " کۆتایی بە پیتی بزوێنی (و)،(وو) هاتبوو لێرەدا لەگەڵ دەستووری ئامرازی"کە"ناڕوات،بەڵکوو ئامرازی (ەکە) وەردەگرن ·

| | | |
|---|---|---|
| پیاو | پیاوەکە، خانوو | خانووەکە |

ئامرازی یەک :

ئەم ئامرازە دەچێتە سەرئەو ناوانەی کەکۆتایی یان بە پیتی بزوێن هاتبێت ( ئا ،ا ، ێ،و ،ی ،ە ) هەروەک ئەم نموونانەی خوارەوە :

چیا + یەک چیایەک، دەریا دەریایەک (ا)

دێ دێ یەک ، هەرمێ هەرمێ یەک (ی)

هەڵۆ هەڵۆیەک ، شانۆ شانۆیەک (و)

کانی کانی یەک ، قوتابی قوتابی یەک (ی)

پەنجەرە پەنجەرەیەک، شووشە شووشەیەک (ە)

ئەگەر هاتوو وشەکەیان ناوەکە کۆتایی بەپیتی بزوێنی(وو ، و ) هاتبێ ناوەکە ئامرازی (یەک) وەرناگرێت بەڵکوو (ێک ) وەردەگرێت . وەک :

خانوو خانووێک نەک خانوویەک

ئامرازی ێک : (ێک )

ئامرازێکی نەناسراوە ، تایبەتە بەو ناوانەی کۆتاییان بەپیتی نەبزوێن هاتووە ، نموونە :

شاخ شاخێک ، بەرد بەردێک

ئـــا مـــرا زی ێ :

ئـــەمەش ئا مرا زێکی نەنا سرا وە ، تا یبەتە بەونا وا نـــەی کـــە کۆتا ییا ن بەپیتی بزوێن نـــەها تووە :

گـــوند گوندێ ، کـــورد کوردێ

ئـــا مـــرا زی ەک :

ئا مرا زێکی نەنا سرا وە ،بەونا وا نەوە دەلکێ کە کۆتا یـــیا ن بەپیتی نەبزوێن . وەک لەخوا رەوەدا دیا رە :

ژن ژنەک ، کوڕ کوڕەک ، کچ کـــچـــەک

لەموکریا ن وهەولێرو گۆڤەرەکا نی کرما نجی ژووروو بەکـــا ر دێـــت . نیشا نەی کۆ بەنا وی نەنا سرا وەوە نا لکێ وبـــۆکـــۆ کردنەوەی ئەم نا وا نە وا ژەی "چەند" "هێندێ" هێـــنـــدێـــک " بەکا ر دەبەین . وەک چەند کەسێک . هێندی کـــەس .

## بەشی پێنجەم

## ( ئامرازی كۆ )

لەزمانی كوردیدا كۆمەڵێك ئامراز هەن دەتوانن ناوی كۆ دروست بكەن ئەوانیش ئەمانەن ( ان، هات ، جات ، وات ، گەل).

ئامرازی (ان):

ئەم ئامرازە دەتوانێ هەموو ناوێكی كوردی بكاتە كۆ ئامرازی ( ان) لەزوربەی زۆری گۆڤارو دیالێكتەكانی زمانی كوردیدا بەكار دەهێنرێت ،لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین (ان) تاقەئامرازی كۆیەو ئامرازێكی گشتی یە كە دەتوانێ ناوی تاك بكاتە كۆ ، وەكوو.

نووسەر + ان نووسەران ،ژن ژنان،پیاو پیاران

ئەگەر ئامرازی (ان) چووە سەر ئەو ناوانەی كە كۆتاییان بەپیتی بزوێن ( آ ، ی ،ێ، ۆ ) هاتوەلێرەدا ئامرازی كۆی (ی) وەردەگرێت وفۆرمی (یان) دروست دەبێت . وەكوو :

چیا چیایان،هەرمێ هەرمێیان،هەڵۆ هەڵۆیان

ئامرازی (آن) دەچێتە سەرناوی ناسراویش ، لێرەدا پیتی بزوێنی دووەمی ئامرازی ناسراو دەكەوێت. بۆنموونە :

پیاوەکە        پیاوەکان

ئامرازی (ان) دەتوانێ بچێتە سەرناوی دیارخەر،بۆنموونە :

خوێندکاری زیرەک        خوێندکارانی زیرەک

لەلێکدانی سینتاکسی سەرەوە ئامرازی (ان) چۆتەسەروشەی خوێندکار کە ناوێکی دیارخەرە ، وەهەروەها نیشانەی ئیزافەت دەکەوێتە دوای ئامرازی (ان) بۆنموونە :

خوێندکاران +ی زیرەک

تێبینی :

١ـ ئەگەر بەدوای ناوی دیارخراودا دیارخەرێکی ناسراو هاتبوو ، ئامرازی (ان) دەچێتە سەر دیارخەرە ناسراوەکە :

خوێندکارە زیرەکەکە        خوێندکارە زیرەکەکان

٢ـ ئەگەر هاتوو دوونا و بەدوای یەکدا هاتبوون وبە یارمەتی ئامرازی پەیوەستی (و ) پێکەوە بەسترابوون ئامرازی (ان) دەچێتەسەر رستەی ناوی دووەم وەکوو :

کرێکارو جوتیار        کرێکارو جوتیاران .

کوڕو کچ        = کوڕوکچان

ئامرازی هات :

ئەم ئامرازە زۆرکەم لەزمانی کوردیدا بەکاردێت وتەنیا لەوشەی (دێهات ، میوەهات )دا دیارە .

ئامرازی جات :

هەروەها ئەمیش ئامرازێکی کۆیە ولەزمانی کوردیدا کەم بەکاردێت ولەوشەی ( میوەجات )دا دیار دەکەوێت.

سەوزە + وات سەوزەوات

ئاغا + وات ئاغاوات

ئامرازی گەل:

ئەمەش هەروەها ئامرازێکی کەم بەکار هاتووە وەک :
کوڕگەل، وەرگەل (بەرخەل) ، گاگەل .

## بەشی شەشەم

## ئامرازی فرمانی(فعل)ی

لەزمانی کوردیدا کۆمەڵێک ئامراز هەیە ، ئەم ئامرازانە لەگەڵ فرماندا دەردەکەون فۆرمی نوێ بۆ فرمان دروست دەکەن، وەک ئامرازەکانی (ب، بایە ،دە ،ەر ، ری، را ) وەک :

| | | |
|---|---|---|
| ١- خواردن | خور (رەگ ) | بخۆ |
| ٢- کردن | کرد ( رەگ ) | کردبایە |
| ٣- پێوان | پێو | پێورا |
| ٤- نووسین | نووس | نووسەر |
| ٥- شێلان | شێل | دەشێلرێ |

١- ئامرازی(ب) :

ئەم ئامرازە تایبەتە بەفرمان - دەتوانێ بکەوێتەپێش رەگی فرمانی کاتی ئێستا وە دەلالەتی داخوازی دروست دەکات ، بۆنموونە :

بخۆ = ب + خۆ

بنووس = ب + نووس

ئامرازی (ب) دەشتوانێ بکەوێتەپێش رەگی رابردووی فرمان لەم حاڵەتەدا دەلالەتی مەرج وئارەزوو دروست دەکات وەک :

بشووشتایه = ب + شووشت + ایه

ئەگەر دەستی بشووشتایە نەخۆش نەدەبوو. بریا دەستی بشووشتایە! لێرەدا جیاوازیەک بەدی دەکرێت لەبەکارهێنانی ئامرازی (ب) ئەگەر ئامرازی (ب) کەوتە پێش رەگی کاتی ئێستا دەلالەتی داخوازی دروست دەکات بەلام ئەگەر کەوتەپێش رەگی کاتی رابردووی فرمان لێرەدا دەلالەتی ئارەزوو ومەرج ( تمنا وشرط ) دروست دەکات .

٢- ئامرازی (دە ):

ئەم ئامرازەش دەکەوێنەپێش رەگی فرمان ،چ رابردوو چ ئێستا ، ئەگەر کەوتە پێش رەگی کاتی ئێستا ، کاتی ئێستای فرمان دروست دەکات ، وەک :

دەخۆم دە + خۆ + م

دەنووم دە + نوو + م

ئەم ئامرازە دەتوانێ بکەوێتە پێش رەگی کاتی رابردوولێرە ـ دا کاتی رابردووی بەردەوام دروست دەکات . بۆنموونە :

دەمشووشت دە + م + شووشت

٣- ئامرازی (را ):

ئەم ئامرازەش دەچێتە سەر رەگی کاتی رابوردوو وئێستا لەفرمانی تێپەڕدا وەفۆڕمی پەسیڤی ( مجهول ) کاتی رابردوو دروست دەکات . بۆنموونە :

ناشتن ناشترا نێژرا

٤ـ ئامرازی (ێ) :

ئەم ئامرازەش دەچێتە سەر رەگی فرمانی (فعل)تێپەڕو فۆڕمی پەسیڤی (مجهول) بۆکاتی ئێستا دروست دەکات . بۆ نموونە :

دەناشترێ دە+ ناشت + رێ

دەنێژرێ دە+ نێژ + رێ

دەبینرێ دە+ بین + رێ

٥ـ ئامرازی (ەر) :

ئەم ئامرازە دەچێتە سەررەگی کاتی ئێستای فرمان وەناوی بکەر ( اسم فاعل) دروست دەکات . بۆنموونە :

نووس + ەر نووسەر

خوێن +ەر خوێنەر

٦ـ ئامرازی (راو) :

ئامرازی (راو) ئامرازێکی تایبەتە بۆ دروستکردنی ناوی بەرکار (اسم مفعول)، ئەم ئامرازە دەچێتەسەر رەگی کاتی ئێستای فرمانی تێپەر فۆڕمی نوێ دروستدەکات بۆنموونە:

نووس + راو        نووسراو

بین + راو        بینراو

## بەشی حەوتەم

## "ئامرازی پەیوەندی"

لەزمانی کوردیدا کۆمەڵەئامرازێک هەیە لەناو رستەی سادەدا بەکاردێت وپەیوەندی لەنێوان دوو وشەی رستەکەدا پەیدا دەکات. ئامرازەکان بریتین لە (بۆ ، ە ، لەگەڵ، لە، بە )

١- ئامرازی بۆ :

ئەم ئامرازە دەتوانێ پەیوەندی لەنێوان دوو وشەی لە ناو رستەیەکدا پەیدا بکات . بۆنموونە :

من چووم بۆبازار

لەڕستەی سەرەوەدا ئامرازی (بۆ ) توانیوێتی پەیوەندی لەنێوان وشەی چووم لەگەڵ وشەی بازار پێک بێنی لەبەر ئەوە پێ ی دەگوترێ ئامرازی پەیوەندی.

٢- ئامرازی (ە ):

ئەم ئامرازەش لەجیاتی ئامرازی "بۆ"ی پەیوەندی لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بەکار دەهێنرێت . بۆنموونە :

من چوومە بازاری

لێرەدا ئامرازی (ە ) پەیوەندی چوو-بازاری پەیدا دەکا

وپێکیان دەبەستێتەوە ولەجیاتی (بۆ) بەکار هاتووە.

٣- ئامرازی لەگەڵ:

ئەمەشیان پەیوەندی لەنێوان دوونا و لەنا ورستەدا پێک دێنێ، بۆنموونە:

ئازاد لەگەڵ رزگار هات بۆئێرە.

٤- ئامرازی لە:

ئەمەش هەروەها ئامرازێکی پەیوەندی یەو لە رستەی کوردیدا ئاشکرایە کەپەیوەندی لەنێوان دوو وشەی رستەدا پەیدا دەکات، بۆنموونە:

نەوزاد لەسالار ناترسێ

٥- ئامرازی بە:

ئەمەشیان ئامرازێکی پەیوەندی یە، پەیوەندی لەنێوان دوو وشەیان دوو بەشی رستە پێک دێنی.

من بەئێوەوە سەربەرزم.

پارەکەم دا بەباوکت.

تێبینی:

لەئامرازەسەرکیەکانی پەیوەندی لەزمانی کوردیدا (و)ە

کەپێوەندی دوو وشەیان دوو ناو یان دووڕستەپێک دێنی.

سێو وپرتەقاڵ میوەن.

من وتۆ براین.

ئازاد هات ومن ڕۆیشتم.

## بەشی هەشتەم

## "ئامرازی خۆزی (کاش)

لەزمانی کوردیدا هەندێ ئامراز هەیە دەچێتە پاڵ خۆزی دەتوانێ رستەی خۆزی دروست بکات . ئەوانەیش بریتین لە ( خۆزگە ، خۆزیا ، بریا ، کاشکی ) .

ئامرازی خۆزگە :

ئەم ئامرازە لەزمانی کوردیدا بەکاردێت بۆ دەربڕینی خۆزی ، بۆنموونە :

خۆزگە سبەی لەهەولێر بەفرببارییە .

ئامرازی خۆزیا :

ئەم ئامرازەش هەروا فۆرمێکی ئامرازی خۆز گەیە ، تەنانەت لەزۆری مۆرفۆلۆژیاوە لێی جیا ئەبێتەوە ، بەلام لەوەزیفەدا یەکن . بۆنموونە :

خۆزیا پیری نەبوایە .

ئامرازی بریا :

ئەم ئامرازەش ئامرازێکە رستەی خۆزی دروست دەکات بە وەزیفەی خۆی هەڵئەسێت .

بریا ئێوە هەمووتان زیرەک بوونایە

ئامرازی کاشکی:

(کاشکی) ش ئامرازە چونکە واتای نی یە . لەبەر ئەوە رستەی خۆزی لەزماندا دروست دەکات .

کاشکی ئەوهەڵەیەت نەکردایە .

## بەشی نۆهەم

### ئامرازی نەفی ( نەریٚ)

لەزمانی کوردیدا سێ ئامراز هەیە نەفی پێشان دەدات ، وەک (نە ، نا ، نەخێر ) لەگەڵ ( مە ).

ئامرازی نە :

ئامرازێکی نەفی یە دەتوانی کردەوە نەفی بکات .

نەخۆم . نەبم . نەنووسم

دەتوانێ فۆرمی پرسیار لەسەر ئامرازی نە دابنێیت ونەفی لەپرسیاردا پێشان بدات . بۆنموونە :

نەچم؟ نەکەم؟

جاری واهەیە ئامرازی "نە" دەکەوێتەپێش ناویش وناوەکەبە نەفی پێشان دەدات . وەکوو :

نەرزگارم دی نەئازاد.

جاری واهەیە لەوەڵامدا فۆرمی«نە»بۆنەفی بەکاردێت . بۆ نموونە : تۆنامەت نووسی؟ نە،

ئامرازی نا :

ئەم ئامرازەلەزمانی کوردیدا زۆر بڵاوە.زۆر بەکار دێت ودەکەوێتەپێش فرمانەوە وفرمانەکە بەنەفی نیشان

دەدات . وەک :

نارۆم . ناخۆم نانووسم .

هەروەها ئامرازی (نا ) زۆرجار دەکەویتەپێش رستەی پرسیاز وەک :

بۆنانووسیت ؟ یان نانووسیت ؟

بۆمەنفی کردنی فرمان ( فعل) لەزەمانەکانی دیکەدا "نە" دەکار دێنین وەک :

نەمدیبوە . نەمدیبوو . نەم دەدیت .

ئامرازی نەخێر :

ئەم ئامرازە بەکار دەهێنرێت بۆوەڵام دانەوەی پرسیار-ێک بەنەفی . بۆنموونە :

ئایا تۆچیرۆکی"لەخەومات" ، خوێندۆتەوە؟ نەخێر .

زۆرجار لەکاتی داخوازیدا (امر ) فۆرمی (مە ) بەکاردێت بۆنەفی . وەک :

مەخۆ ، مەرۆ ، مەنووسە ، مەبە ، مەکە .

## بەشی دەهەم

## ئامرازی پلەی بەراوردوو بالا

## ( أدا ةدرجا لمقا رنەوا لاستعلا )

لەزمانی کوردیدا سێ ئامراز بۆ پلەی بالاو بەراوورد ، بەکار دەچن کە بریتین لە ( تر ،ترین ، هەرە ) ئەمئامرازانە تایبەتن بەئاوەڵناودوە (صفت ) و دەچنەسەر ئاوەڵناوپلەی بەراورد و بالا پێشان دەدەن. بۆنموونە :

جوان جوانتر جوانترین هەرەجوانتر

١- ئامرازی تر :

ئامرازێکە بەراوردوو پێشان دددات وپلەی بالا لە ئاوەڵناوێکدا بەنیسبەت دەردەخات .ئاوەڵناوێکی دیکە . ئەم ئامرازە لەزمانی ئەدەبی کوردیدا زۆر ئاشکراو،یارە بۆ نموونە :

زیرەک زیرەکتر ئەحمدد لەهیوا زیرەکترە

جوان جوانتر نەشمیل لەمریەم جوانترە

٢- ئامرازی ترین :

ئەم ئامرازە پلەی بەرزترپێشان دەدات . وەک :

بەرز بەرزترین ، دەماوەند بەرزترین کێوی ئێرانە .

٣ـ ئامرازی هەرە :

ئەم ئامرازە پلەی بالآ نیشان دەدات لەوەزیفەدا بە هێزترە لەهەر دووئامرازەکانی تر وەک : تر ، ترین،
ئامرازی "هەرە" هەرەبەرز هەر دەکەوێتەپێش ئاوەڵناو .
جاری وا هەیە ئامرازی (هەرە) دەکەوێتەپێش ئەوئاوەڵناوەی کە کۆتایی بە ئامرازەکانی تر ،ترین هاتووە ، لێرەدا هاتنی هەرە تەنها بۆ دووپاتکردنەوەیە . بۆنموونە :
هەرە جوانتر ، هەرە جوانترین

## بەشی یازدەهەم

## ئامرازی داواکردن وپاڕانەوە

## اداة الطلب والترجی

لەزمانی کوردیدا تاکەئامرازێک هەیە بۆ داواکردن و پاڕانەوە ، ئەویش (تکایە) بۆنموونە :

تکایە قسەمەکەن

تکادەکەم زووتر وەرە .

پێشەکی:

زۆر بەپێویستمزانی کەکارێکی تایبەت بەئامرازی سینتا-
-کسیەوە بنووسم وپێی توانا لێی بکۆڵمەوە، چونکە
ئامرازی سینتاکس لەرووی ئەرک ووەزیفەوە دەورێکی هێجگار
باش دەبینێ لەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ،لەلایەکی ترەوە
لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردیدا لەبارەی ئامراز
بەتێکڕایی وئامرازی سینتاکسی یەوە بەتایبەتی کارێکی
سەربەخۆ نابینرێت ، جگەلەوە نەبێت ، کە نووسەرانی
ڕێزمانی کوردی لەلایی کتێبە گراماتیکیەکانیاندا
بابەتی ئامرازیان پێکارەو لەگەڵ ئەوەشدا نووکی
خامەکانیان تۆزێک بەلای ئامرازی سینتاکسی یەوە لای
کردۆتەوە.

پێکان وباس کردنی ئامرازی سینتاکسی لەلایەن نووسەرانی
ڕێزمانی کوردی یەوە کارێکی بێ ئەندازە گرنگەوخزمەتێکی
باشی ڕێزمانی کوردی بەتێکڕایی وسینتاکسی کوردی بەتایبەت
دەکات.

ئێمەش ویستمان ، کەسووچێکی ئەمە پڕبکەینەوە وهەندێ

نا تەواوی راست کەینەوە . هەروەها تا ئامرازی سینتاکسیش ، باسێکی سەربەخۆی هەبێت . بۆئەم مەبەستانەش بەپێی توانا و زانستانە لەهەندێ ئامرازی سینتاکسی کوردیەوە دواویـن جگەلەوەش بۆ ئەوە ، کەکاری ئێمەش بچێتە پاڵ کاری ئەوان و سووچێکی خزمەتگوزاری بگرێ.

باسەکەمان لێکۆڵینەوەیەکی کورتە۔ هەرچەندە دەبا بە قووڵی وفراوانتر بچووما یە ناو باسەکە ۔ بەلأم بەپێی توانا هاتووەو بەپێی لەدەستهاتنەوە نووسراوە ، بەڵکوولەهەلێکی ۔ تریان پیاچوونەوەیەکی تردا بە قووڵترو بەفراوانتر بڕۆمەناو باسەکەو قووڵ وفەراوانی بکەمەوە .

ئەم کارەمان لەم کورتەپێشەکیـیەو چوار بەش وئەنجامێک پێکهاتووە . بەشی یەکەم سەبارەت مێژووی باسەکەیە .بەشی دووەم لەئامرازەکانی سینتاکسی بەگشتی دەدوێ وباسی ئەم بابەتانەش دەکات : زاراوەی ئامراز ، پێناسینی ئامراز لەرووی دروستبوون ولەرووی ئەرکەوە، بەشی سێیەمی سەبارەت ئامرازی پەیوەستدارە لەرووی زاراوەو جۆرەکانیەوە .

بەشی چوارەمی لەبارەی ئامرازی گەبەنەرەوە قسەدەکات و زاراوەوجۆرەکانی دەخاتەروو .

نموونەکانی ئەم کارەشم لە بەرهەمە چیرۆکیەکانی شارەزاو ئەدیبانی کورد وەکوو دکتۆر مارف خەزنەدار و دکتۆر کاوس قەفتان وحوسێن عارف وپەندی کوردی، کەبەرێز کەریم شارەزا کۆی کردوونەتەوە، هەڵبژاردوون و کۆم کردوونەتەوە ولێم کۆڵینەتەوە وخستوومنەتە ناوباسەکە .

سەرچاوەشم لەبارەی رێزمانی کوردیەوە بە کوردی و عەرەبی وروسی وئینگلیزی بینیوەو چی لەبارەی ئامرازەوە نووسراوە بەوردی خوێندوومەتەوە وسوودم لێ وەرگرتوون .

## بەشی یەکەم

### (مێژووی لێکۆڵینەوەلەئامرازەکانی سینتاکسی)

زۆر لەزانا و ڕێزمان نووسانی کوردو غەیری کورد لە کتێبەڕێزمانییەکانیاندا شتوبابەتی بەنرخیان لەبارەی ئامراز بەگشتی وئامرازی سینتاکس نووسیوە ، لەگەڵ ئەوەش نووسینەوەکە لەکەم وکورتی ڕزگاری نەبووە ، کەلەم لێکوڵینەوەیەدا بەوردی لەسەری دەدوێین . ئەمزانا ورێزمان نووسانەش ئەمانەن : ک ، ک ، کورد وییێف ،چ،خ، بەکاییێف س، ی، سوکرمان ، تۆفیق، وەهبی، سەعید سدقی کابان ، د، ن مەکەنزی، نوری عەلی ئەمین، جگەرخوێن، محەمەد ئەمین هەورامانی، مستەفا خوڕەمدڵ، ئەحمەد حەسەن ئەحمەدولێژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ودکتۆر ئیبراهیم عەزیزئیبراهیم ـ خاوەنی ئەمکارە .

جاگەر بەوردی سەرنجی ئەم کارانە بدەین ، بۆمان دەردەکەوێت ، کەلەکارەکاندا چەند ناتەواویەک هەیە بەڵکوو ئەم باسەمان بتوانێ هەندێ ئەم ناتەواویانەچارەسەر بکات وبیخاتەپێش چاو . سەبارەت کارەکانی ک ،ک . کوردۆـ یێفەوەچەند تێبینیەک بەرچاو دەکەوێت ،لەگەڵ ئەوەشدا

که کارەکەی زانای بەرێز کوردۆ بۆ گومانەلەوەی،کە کارێکی زانستیەو نووسەری بەرێز بەقوولی چۆتەناو باسەکانەوە لە رووی سینتاکسیەوە باسیان دەکات . بەرێز کوردۆ هەندێ ئامرازی بەکار نەهێناون وەکوو : (وە ، هەروەها ، بەڵکوو ، هێشتا ، ئەنجا ) لەرووی مێژووی داهاتنیانەوە باسی نەکردوون ،بەرای ئەوئامرازەکانی لێکدراو کۆنترە لەهی سادە ، ئامرازی (بۆئەوەی کە ، تاوەکوو ، لەبەرئەوە چونکە )ی بەلێکدراو دانەناون لەبارەی دروستبوونیانەوە ( کەی) بەئامرازدانا وە ، باسی ئامرازی گەیەنەر " کەچی" ناکات . هەروا باسی ئامرازی گەیەنەر (تا )ی نەکردووەلە کتێبی زمانی کوردی ، کەبەکوردی داینا وە دەلێت ئامرازی گەیەنەر خەبەروفعلان پێکەوە دەبەستێتەوە .

ئێمە لەمکاردماندا باسی ئەم ئامرازانە دەکەین، کە ماموستا کوردۆ بەکاری نەهێناون ، لەرووی ئەوەی ، کە باسی مێژووی ئامرازەکانی نەکردووە ، ئێمە باسی مێژووی ئامرازی گەیەنەر (کە ) دەکەین، لەبابەت ئەوەی کە دەڵێت ئامرازەکانی لێکدراو کۆنترن لەهی سادە ، کەبە پێی

تەرازووی زانستی زمانەوەکە وشە یان دەربڕینی تر لە سادەیەوە بوونەتە لێکدراو، جا بەمەوە دیارە کە سادە کۆنترە لە هی لێکدراو، ئامرازەکانی ( بۆئەوەی کە ، تا وەکوو ،لەبەرئەوە، چونکە ) بەئاشکرا دیارن کە لێکدراون لەدوو بەش یان زیاتر پێکهاتوون.

ئامرازی ( بۆئەوەی کە ) دیارە کەلەچواربەش پێکهاتووە لە ( بۆ+ ئەوە+ ی + کە ) ئامرازی ( تاوەکوو ) ئەویش ئامرازێکە ولەدووبەش پێکهاتووە ، لەبەشی ( تا ) ، کە ئامرازێکی گەیەنەرەو ( وەکوو ) کەئامرازێکی پەیوەستدارەو بەهەردووکیان ئەمەیان پێکهێناوە. ئامرازی (لەبەرئەوە )ش پێکهاتووە لەدووبەش بەشی یەکەم ( لەبەر )وبەشی دووەم، ( ئەوە ) کەراناوی نیشانەی دوورەو ئامرازی ( لەبەرئەوە )ی گەیەنەری دروستکردووە .

ئامرازی ( چونکە )ش هەمیسان لە دووبەش پێکهاتووە، لە بەشی ( چون) کەلەبنجدا لە (چۆن)ەوە هاتوەو ئامرازی گەیەنەری (کە ) شی چۆتە سەرو، ئامرازی ناوبراو دروست بووە، بەهەردووکیان ئامرازی گەیەنەری ( چونکە ) یان

پێکهێناوه ، لەزمانی کوردیدا ( کەی) بەهیچ جورنا بێت ئامرازی گەیەنەر ، من سەبارەت بەئەوه زۆر شتم پشکنیوه نەمدیتووه ،ئەمه ئامرازی گەیەنەربێت . هەروا زۆرچیرۆکم پشکنین ، بەڵکوو رستەیەکم دەستکەوێ کە تێیدا ( کەی) ئامرازی گەیەنەر بێت ، کەچی دەستم نەکەوت ، لەم دێڕەی خوارەوه بەولاوه :

پەلەی بوو

کەی

ئەگاتە کۆڵانەکە ( خ،ئا ، ل ١٧٠)

لەم رستە لێکدرا وەدا دەربڕینی (کەی) هەیە ، بەڵام ئامرازی گەیەنەر نیە و واتای (کەی؟) پرسیار دەگەینێت .کە لەزمانی کوردیدا هەر بۆئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێت نەک بەمەبەستی ئامرازی گەیەنەر .

ئێمە سەبارەت بەئامرازی (کەچی) دەدوێین هەروا بە پێی توانا هەوڵ دەدەین کە بەراوردێ لەنێوان ئامرازەکان پێشان بدەین . سەبارەت ( تا )ش دەدوێین ، ئامرازەکانی گەیەنەر ناتوانن خەبەر وفێعلان بەیەکەوه ببەستنەوه هەر

وەک لەم کارەدا بەدیار دەکەوێ.

مامۆستا وزانای بەرێز چ ـ خ ـ بەکاییف لەکارەکانیدا سەبارەت بەئامرازەکانی سینتاکسی دواوە، لەم دوانەدا هەندێ شتی باسکردووە بەرای ئێمە شێوەیەکی ترە وەک ( ئەگەرکو )ی لەرووی دروست بوونەوە بەسادە دانا وە،کەلێی ورد دەبیتەوە ئەم ئامرازەسادە نیە ولێکدراوەو لە ئامرازی گەیەنەری مەرجی " ئەگەر " وئامرازی گەیەنەر"کو" پێکهاتووە، .کەلەدیا لێکتی سۆرانیدا بەرامبەری نیە،(یاکو )ی بەئامراز داناوە، بەلاّم (یاکو ) ئامرازنیە چونکە لە (یا ) و ( کو ) پێکهاتووە، (یا ) لەکرمانجیدا راناوی نسبەتدارە بۆمێینەبەکار دهینریت و ( ئەوەی) سۆرانی دەگرێتەوە، جاتێکرایی ئامرازەکە لەسۆرانیدا ( ئەوەی کە ) ددگرێتەوە دەربڕینی ( ئەوەی کە ) لەدیالێکتی سۆرانیدا ئامرازی، گەیەنەر نیە، ئەوەی ئامرازەلەدەربڕینەکەدا هەر تەنها ( کە )یە، ئەوەی دەمێنێتەوە لە دەربڕینەکەدا وشەی ( ئەوەی) لەسۆرانیدا ووشەی (یا ) لەکرمانجیدا پێیان دەوترێت وشەی یان راناوی نسبەتدار. بەرووسی پێی دەوترێت

( سەئەتنەسیتلینیسڵەقە Saotnasitetnie Slava) هەروا باسی

هەندێ ئامرازی تر دەکات وەک : ( ماکو ، ئەماکو ، یا ژی

وەختێ کو ، ئوسا ژی ، هن ژی). بەرێز وهێژا ماموستا

بەکا یێڤ چ،خ، ئامرازی ( وەکوو )ی بەکار هێناوە ، کەوا باسی

دەکات وەک ئامرازێکی گەیەنەر ، بەڵام لێکوڵینەوەی ئێمەدو

نموونەکانی ئێمە لەدیالێکتی سۆرانیدا پێشانمان دەدەن ،

کە ئەم ئامرازە ئامرازێکی پەیوەستدارە نەک گەیەنەر

هەمان ئامراز لە دیالێکتی سۆرانیشدا هەیە . بەدرێژی

باسی ( چەوا ) دەکات وەک ئامرازێکی گەیەنەر. بەڵام تێبینی

ئێمە بۆ ئەوە دەچێت ، کە ( چەوا ) ئامرازی گەیەنەر نیەو

هەروا ئامرازی پەیوەستداریش نیە چونکە ( چەوا ) جێگای

( چۆن؟ ،هەر ) دەگرێتەوە لەم رووەوە ( چەوا ) دوو ئەرکی تر

لە رێزماندا جێ بەجێ دەکات ، یەکێکیان راناوی پرس

دروستکردن وئەوەی تریان راناوی دیارخەر . ئەوکاتە (چەوا )

دەبێت بەئامراز ، کەلەگەڵ ئامرازی گەیەنەر (کە )دا هات و

دەربڕینی ( چەواکو ) دروست دەبێت ..... هەردوو دکتۆران

کەریمی رەحمانی ئەییووبی و س . ئا ، سمیرنۆفەی خێزانی

لە کتێبەکەیاندا لەئامرازەکانی سینتاکسی کوردیدا دواون.
بەڵام هەندێ ئامرازیان باس نەکردوون وەکوو ئامرازەکانی
( ئەنجا ، هێشتا ، بەڵکوو ) ئێمە لەم کارەدا بەدرێژی
باسیان دەکەین .... لەرووی ئەرک وفەرمانەوە باسیان
نەکردوون شوێنی ئامرازەکانیان لەناو رستەی کوردیدا باس
نەکردوون ، ئێمە ئەمەش باس دەکەین ، دەربڕینی ( هەتاکو-
نێ)ی بەئامراز داناوە ، بەڵام لەرووی ئەوەی، کە ئەمە
ئامرازێکی شێوەی موکری زمانی کوردیە راستە ، بەڵام لە
نووسینی ئەدەبیدا کەم بەکار دێت چونکە لەشێوەی ئاخاوتنا
زۆرتر بەکار دەهێنرێن ....
دکتۆر د- ن - مەکەنزی لەکارەکەیدا بەس باسی
ئامرازی گەیەنەر (کە ) دەکات لەباسی هەندێ رستەدا ......
بەرێز مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ئامراز دواوە، ئەو
ناویان بەوشە دەبات . بەرای ئێمە هەرچەندە لەرواڵەت
وشەن، بەڵام لەئەرک وئامرازی فەرمان دان،لەبەر ئەوە
هەر ئامرازن و وشەنین . بە تێکەڵاوی لەسەر ئامرازەکان
دەدوێت ولێکی جیا نەکردوونەتەوە . ئێمە لەم کارەدا بەرێک

وپێکی باسیان دەکەین ولێیان دەدوێین. ژمارەیەکی زۆری لە ئامرازەکان باس نەکردوون ولەبارەی ئامرازی گەیەنەرەوە نادوێت .....

مامۆستا سەعید سیدقی کابان تێکەڵاوی وپەنا پەنا لە بارەی هەندێ ئامرازەوە دواوە. بەڵام دوانێکی کورت. لە بارەی ئامرازی گەیەنەر "کە"وە چەند قسەیەکی کردووە....

بەرێز نووری عەلی ئەمین لەئامرازەکانی کوردی دواوە، زاراوەی پێ بەستی بۆئامرازی پەیوەستدار بەکار هێناوە ئامرازەکانی ( مەگەر ) و ( چونکە ) ی بەئامرازی لێکدراو داناون لەرووی دروستبوونیانەوە. ئەمەیان راستەکەهەردوو ئامرازەکان لێکدراون ولەدوو بەش پێکهاتوون لە ( مە )و ( ئەگەر ) ئەوەی تریان لە ( چون) و ( کە ). مامۆستا نووری عەلی ئەمین بەرێک وپێکی لەبارەی ئامرازەکانەوە نەدواوە. بە تێکەڵاوی باسی کردوون. نووری عەلی ئەمین (ش و )ی بە ئامراز داناوە، بەڵام لێرەدا بەلێکوڵینەوە لای ئێمە دەردەکەوێت، کەهەر تەنها (ش) ئامرازە وئامرازێکی پەیوەستداری لکاوە (و ) هیچ پەیوەندی بەئامرازەوەنیە

هەروەها ماموستای بەڕێز (نەء )ی بەئامراز داناوە ، بەرای ،
ئێمە ئەم (نەء )ە بەهیچ جۆر ناچێتەناو قالبی ئامرازی
سینتاکس بەڵکوو تەنها ئامرازی نەفیەو بۆ نەفی بەکار
دێت نەک بۆ بەستنەوەی دوو ڕستە بەیەکەوە لەهەندێ
گۆڤەرەکانی زمانی کوردی ودیالێکتی کرمانجی سەروو بە
( نەک ) بەکار دێت ....

جگەرخوێن هەرباسی ئامرازەکانی گەیەنەر دەکات وەک
( ئەگەر ، گەر ، ئەر ، وەر ، مەگەر، هەکە ، کو ، هەتا ، حەتا ،
هنگێ) لێرەدا ئامرازەکانی ( ئەگەر ، گەر ، مەگەر ) هەر
یەک ئامرازن، بەلام بەرواڵەتی دروست بوون لێک جیان وەک
( گەر ، مەگەر ) هەر ئامرازی ( ئەگەر )ن هەروا ( ئەر )
ئەویش هەر بەواتا و وەزیفەی ( ئەگەر ) بەکار دەهێنرێت .

( هەکە ) لەدیالێکتی سۆرانیدا بەرامبەر ( هەرکە )
دەوەستی، لەم دیالێکتەدا ( هەرکە ) ئامرازنیە ، بەڵکوو لە
دەربڕینی ( هەرکە )دا هەر ( کە ) ئامرازەوەبەس ، ماموستای
بەڕێز جگەرخوێن ( هنگێ )ی بەئامراز داناوە بەلام بەرای
ئێمە ( هنگێ) ئامرازنیە . کەبتوانێ دوو ڕستە بەیەکەوە

ببەستێتەوە ، ( هنگێ) لەناوچەی موکری وڕواندوز ومێرگەـ
سوور وسێدەکاندا و هەندێ ناوچەکانی تردا بە ( هەنگێ)بەکار
دەهێنرێ، (هەنگێ) واتای ئەوکات دەدات ، ( ئەوکات ) یش
لەزمانی ئەدەبی کوردیدا بەئامراز نەهاتووە ونایەت و
بەکار ناهێنرێت ، هەروا ( هەنگێ) نەئامرازی پەیوەستدارەو
نەئامرازی گەیەنەریشە . ماموستا جگەر خوێن بەتێکەڵاو ی
باسی ئامرازەکانی کردوون وباسی ئامرازەکانی پەیوەستدار
ناکات ..... محەممەد ئەمیس هەورامانی لەکتێبەکەیدا
باسی ئامرازی کردووە . لەباسەکەیدا رێکوپێکی نابینرێت
باسی ژمارەیەکی تەواو لەئامرازەکانی پەیوەستداروگەیەنەر
ناکات . باسی ئەوە دەکات کە (و ) دەتوانێ جگە لەبەیەک
بەستنەوەی دوو رستە دوو ناویان دوو وشەی تر بەیەکەوە
ببەستێتەوە .

ئامرازی ( کەوا )ی بەئامرازی گەیەنەر داناوە کەچی لە
( کەوا )دا هەرتەنها ( کە ) ئامرازە وگەیەنەریشە ، بەڵام
(وا ) پەیوەندی بەئامرازەوە نیە ،بەڵکوو هەبوونی لێرەدا
بۆ بەتین کردن و واتا وئەرکی ( کە )یە ، بۆ ئەمەیان

بۆ تێکڕای ڕای مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی سەبارەت بە ئامرازی (کە) دەتوانی بنۆڕیتە کارەکەم بەکوردی یان بەرووسی ....

لیژنەی زمان وزانستەکانی زانیاری کورد بەشێوەیەکی دوورو درێژ لە ئامراز دواون وباسی ئامرازی مەبدستسا ـ نیشانی کردووە. لەباسەکەدا لیژنەی هێژا بەداخەوە یاسایەکی زانستی بەدی نەکردووە، باسەکە هەر باسێکی ئاسایی یەوە هەروا بە شێوەیەکی رەخنەیی تەوا و لە ئامرازەکان نەدواون تەنها چەند ئامرازهەیە، کەلەلایەن رێزمان نووسانەوە نووسراود چ لە وتارەکانیاندا یان لە کتێبەکانیاندا ئەوانیش تۆماریان کردووە وکۆیان کردۆتەوە لەبەر ئەوە باسەکە هەر کۆکردنەوەیەکی گشتی ئەو ئامرازانەن وبەس ولابەلایی لەسەر هەندێکیان دواون. لە باسەکەی کۆڕدا ئێمە چەند شتێکمان تێبینی کردووە. وەک : (چون) ئامرازی سینتاکس نیەوئەوان بەئامرازیان دانـاوە. ئەوەی دیارە ئەوەیە کە (چون) بۆپرسیار دروستکردن راستە ئامرازە، بەڵام بۆبەستنەوەی دوو رستە بەیەکەوە ئامراز

نیه ، جا هەڵەکەی کوڕ لێرەدایە ، کە (چون) بەئامرازی پەیوەستدار دادەنێن ودەڵێن کەئەم ئامرازە دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە . بەشێوەیەکی تێکەڵاو باسی ئامرازەکانی گەیەنەرو پەیوەستدار دەکەن ، کەچی دەبێ هەردوو جۆرە ئامرازەکەلێک جیا بکرێنەوە ، چونکە جیاوازی زۆر لە نێوانیاندا هەیە . لەرووی دروستبوونی ئامرازەکانەوە نەدواون، دەڵێن کەئامرازی (و)ی پەیوەستکات پێشان دەدات بەڵام بەم لێکۆڵینەوەیەی، کەئێمە لەبەر دەستمانە دەر ، دەکەوێ کەئەم ئامرازە بەهیچ جۆرێک واتای کات نابەخشێت وکات پێشان نادات ، لەکارەکەی لیژنەدا هاتووە ، کەنەفی وئامراز پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە ، گومان لەوەدا نیە کەنەفی وئامراز پەیوەندی یان بەیەکەوە هەیە . هاتنی ئامرازی( نەفی ) ـ نەـ لەزمانی کوردیدا هەندێ جارلەگەڵ ئامرازی پەیوەستدار ( وەکو )و دەربڕینی ( نەوەکوو )دروست دەکات وانا گەینێ، کەنەفی وئامراز پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە . سەرەڕای ئەوەش هەریەکە بۆ مەبەستێک لەرستەدا بەکاردێن . لیژنەی بەرێز دەڵێت (ش) بۆ بەستنەوەی دوو

رستە بەکاردێت ، بەڵێ ئەمەراستە ، بەڵام ئەگەر هات لە
ناو رستەدا لە (ش) زیاتر هیچ ئامرازی ترمان نەبوون، بەڵام
ئەگەر ئامرازی تر هەبوون وەک ئامرازی (و ) بەتایبەتی
ئەوە لێرەدا (ش) ئامرازی پەیوەست نیە بەڵکوو ئامرازی
پەیوەست ئامرازی (و )ە ، (ش) لێرەدا بۆ دووبارەکردنەوە
بەکار دێت وەک بڵێین منیش ، تۆش، ئەویش ... هەروەها
لەکتێبەکەدا هاتووە ، کەدەبێت لەگەڵ ئامرازی (و )ی
پەیوەستدار (و ) یەکی ترێت ، چونکە هاتنی (و )ی پەیوەستد
ـار ئامرازێکی سەربەخۆیەو توانای زۆری هەیە بۆ بەیەک
بەستنەوەی دوو رستەو ئەرکی خۆی دیارە وپێویستی
بەشتێکی ترنیە ، هەروەها سەبارەت بەئامرازی (و)ی پەیوەستدار
دەڵێین کەئەمە دەتوانێ ببێ بەبزوێن ، بەڵێ راستە (و )
پیتێکی بزوێنەرە لەزمانی کوردیدا ، کەلەقەوارەی فۆنۆتیکدا
باس بکرێت ، بەڵام گەرباسی پێکەوە بەستندوەی دوورستەی
سادەبێت (و )پیت نیە ، بەڵکوو ئامرازە وناب‌ێ ناوێکی تری
لێبنرێت ، لیژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد
باسی ئامرازی (وە ) ناکات . دەڵێین، کەئەم ئامرازە

عەرەبیە وکوردی نییە. بۆیە ئێمە لیٚ ی نادوێین، بە کۆلّینەوەی ئێمە لەئامرازەکانی زمانی کوردی زۆر ئامرازی (وە) کەوتوونە بەرچاو، کەدوو رستەی بەیەکەوە بەستۆتەوە جالەبەر ئەوە (وە) ئامرازی پەیوەستدارەودوورستەبەیەکەوە دەبەستێتەوە لەزمانی کوردی ونووسینی کوردی وئاخاوتنی کوردیشدا زۆر بەرچاووگویٚ دەکەویٚ، گەر هەرهەمان کتێبی رێزمانی کوردی کەلیژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد دایناوە گومان لەوە دانە پترلەهەزار ئامرازی (وە)مان بەرچاو دوکەویٚ. بۆنموونە سەیری ئەم نموونەی خوارەوەبکەن :

لەوکارانەدا کەپاشگری (ەوە)یان بەدوادا دیٚ، وە:

بەهۆی (اندن)ەوە کراون بە(متعدی)....

یان لەدەنگەوە بوونەتەکار، (اندن) لەپێشەوە دیٚ.

(رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ل ، ١٢٢)

گەرسەیری ئەم رستەیەبکەین دەبینین (وە) وەک هەموو ئامرازەکانی پەیوەستدار دوو رستەی بەیەکەوە بەستوونەتەوە

کەئەمانەن: ( پاشگری (ەوە ) یان بەدوادادێ) ( بەهۆی
(!ندن)ەوە کراون بەمتعدی).

ئێمەش لەم کارەماندا وەک ئامرازێکی پەیوەستدار باسی
ئامرازی (وە ) دەکەین. لیژنەی بەڕێز هەمووئامرازەکانیان
لەقالبی ئامرازی ( عطف )دا باسکردوون، ئەوەی،
شایانی باسە ئەوەیە ، کەهەموو ئامرازەکان ناچنەپال
ئامرازەکانی ( عطف)ەوە .

(نەء ) بەئامرازی (عطف) دانراوە ،هەروەک لەپێشدا
ووتمان، کە ( نەء ) ئامراز نیە بۆپێکەوە بەستنەوەی دوو
رستە .

ئامرازی( کە ) بەراناوی لێکدەر باس دەکەن، ئەبێ
بزانین کەئامرازی کەئامرازێکی گەیەنەرە ، رستەی شوێن
کەوتوو دەگەینێتە رستەی سەرەکی وبەهیچ جۆرراناو نیە. بۆ
پتر روون کردنەوە دەتوانن سەیری کارەکەم بکەن ( رستەی
لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی
دیارخەری لەدیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ـ بەشی
یەکەم ـ رۆلی ئامرازی گەیەنەر (کە ) بەرووسی وبەکوردی

دەستنووس، ـ) .

لیژنەی زمان وزانستەکان دەڵێن ، کەئامرازی ( یـا ) دووبارە دەکرێتەوە و ( یا .... یا ) دروست دەکات بەڵام بەرای ئێمەئامرازی (یا ) دووبارە ناکرێتەوە بەڵکوو دەربڕینەکانی (یا ...یا ) ،(یان.... یان) لە عاستی خۆیاندا ئامرازی سەربەخۆن ولەئەرک و واتادا لە(یا ) جیادەبنەوە .

لیژنەئامرازی نەفی (نە ) یان بەئامرازی بەستنەوەی دوورستە بەیەکەوە داناوە ،بەڵام لێکۆڵینەوەی ئێمە ( نە ) هەر بەئامرازی نەفی دادەنێت وهیچ پەیوەندیەکی بە ، ئامرازی پەیوەستدا رەوەنییە .

خاوەنی کتێبی ریزمانی ئاخاوتنی کوردی ئامرازی (تا ) ی بە ئامرازی گەیەنەر باس نەکردووە ودەڵێت بۆمەرجە ، کە چی زۆر ئاشکرایە کەئەم ئامرازە یەکێکە لەئامرازەکانی گەیەنەری زمانی کوردی ، کەرستەی شوێن کەوتووی ئەندازەیی وئامانجی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی.

رێزمانی ئاخاوتنی کوڕ بەبێ کۆڵینەوە لەسەرئامرازەکانیان قسەکردووە . " بەشکوو " ئامرازێکی جیاوسەربەخۆنییە

هەروەک لیژنە باسی دەکات .بەڵکوو ئەمە حاڵەتێکی ئامرازی ( بەڵکوو)ی پەیوەستدارە .

لیژنە " جگە "ی بەئامراز داناوە ، کەچی "جگە " ئامرازێک نیەکە دوورستە بەیەکەوە ببەستێتەوە .

لەکتێبی رێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا هاتووە کە " هەر " ئامرازە ئێمە لەو قەناعەتە داین کە "هەر " ئامراز نیەو راناوێکی نادیارە هیچ پەیوەندییەکی بەئامرازەوەبەگشتی وە بەتایبەتی لەئاست بەیەکەوە بەستنەوەی دوورستەنیە .

لەکتێبی ناوبراودا " هەرکە " بەئامرازی لێکدراودانانێن بەڵام کەسەیری دەربڕینی " هەرکە " دەکەین لەدووبەش پێکهاتووە لەبەشی " هەر " وبەشی "کە " ئەمەشیان لە هەمان کاتدا ئامرازە وبەڵگەی کات دەگەیەنێ.

لیژنەلەکتێبەکەیدا باسی ئامرازی "کەچی" گەیەنەر دەکات، بەڵام لەباسەکەدا بەهەڵە چوون وسەریان لێ دەرنەچووە ، کەچیە . بۆیە دەڵێت پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی ـ ترە ، دیارە ، کەئامرازی "کەچی" ئامرازێکی گەیەنەرەو ، رستەی شوێن کەوتووی ناچارەیی دەگەیەنێتەرستەی سەرەکی.

هەروا "کەچی" بەرامبەربە " ئەگەرچی" و " شەرچی" یان دانا وە، بەڵام بەڕای ئێمە ئەمە تەواو نیەو ناتەواوو نا راستە، چونکە هیچ پەیوەندییەکی سینتاکسی یان واتایی لەگەڵ " کەچی" و " ئەگەرچی" و" هەرچی" دا نیە. ئێمەبە شێوەیەکی ترلەسەر ئامرازی "کەچی" گەیەنەر دەدوێین ....

هەروەک لەکتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا هاتووە کە چەند کەسێکی ترلەئامراز دواون وەک : مامۆستا رەشید کورد لەکتێبەکەیدا " رێزمانی زمانی کوردی، ل "ناوی ئامرازدەبات بەئامرازی " پێوەند".....

مستەفا خوڕەم دڵ باسی هەندێ ئامرازی سینتاکسی کوردی کردووە وەک : (وا ، ئەوتۆ ، کە ، چی، چە ) بەڵام وادیاردلەم هەسوو ئامرازانە هەر تەنها " کە " ئامرازەو گەیەنەرە، ئەوانی تر ئامراز نین ، بەڵکوو شتی تری رێزمانین وەک: "چی، چە " راناوی نادیاران "وا " دەربرینێکە دەکەوێتە سەر "کە " وئەرکی بەهێز دەکات ........ ئەرنستمەکاروس باسی ئامرازی "کە " دەکات ودەڵێت ، ئەم ئامرازەدەتوانێ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بگەینێتەڕستەی سەرەکی....

ئەحمەد حەسەن ئەحمەدیش لەکارەکەیدا لەبارەی ئامرازی "کە" دواوە. ماموستای ناوبراوی بەرێز "کە"بەرانا ودادەنێت بەڵام "کە" بەهیچ جۆر رانا ونیەبەڵکوئامرازەوگەیەنەریشە.

دکتۆر کوردستانی گیوی موکریانی لە وتارەکەیدا دەڵێت، کەلەزمانی کوردیدا ئامرازی "و" دەوری ئامرازی خستنەسەر ( ئیزافەت ـ نووسەری ئەمکارە ) دەگێرێ تەنێ لەوبارەدا، کەدیارخەر بریتی بێ لە ئاوەڵناو. بۆوێنە:

جزیری هۆنەرێکی هەست باریک وخەیاڵ ناسک وخۆش راوێژو لێبڕاوبوو. ( دیوانی جزیری) هەروا نووسەری ووتاردەڵێت، لەرستەی سەرەوەدا گەربێت ئامرازی "و"بە ئامرازی خستنە سەر (ـ ی) بگۆردرێت، ئەوا واتای رستەوسازدانی لەرووی رستەسازیەوە ناگۆڕێ:

جزیری هۆنەری هەست باریکی خەیاڵ ناسکی خۆراوێژلێبڕاوبوو. دکتۆر کوردستان فاریزەش لەدەوری ئەرکی ئیزافەت دەداتە قەڵەم.

ئێمە لەئاستئەمەوە دەڵێین، کە خستنەسەر (ئیزافەت) ئامرازنیە من لەنامەی دکتۆرای خۆمم بەئامرازلەقەڵەم

نەداوە ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر ئامرازی "و" لێرەدا وشەکانی رستەکە، کەئەمانەن (باریک ـ خەیاڵ ـ ناسک خۆش ـ راویژ ـ لێبراو) بەیەکەوە دەبەستێتەوە جا لەرووی، ئەرکەوە تۆزێک خۆی لە ئیزافەت نزیک دەکاتەوە ، ئەگینا ئیزافەت وئامرازی "و"لێک دوورن. لەبەر ئەوەش ناتوانین، بلێین ،کەئامرازی "و" دیارخەر ودیارخراو بەیەکەوە دەبەستێتەوە، جونکە ئەوکاتە زاراوەی دیارخەرودیارخراو بەکاردێت ،کد بەیارمەتی ئیزافەتەوە پێکەوە ببەسترێتەوە یانی لەدەربڕینی سینتاکسی دیارخراو ودیارخەردا ئیزافەتیش یەکێکە لەوان ....

منیش کەخاوەنی ئەمکارەم ،لەنامەی دکتۆراکەمدا سەبارەت بەئامرازی "کە" بەتەنی دواوم ورۆڵی ئەم ئامرازەم لە گەیاندنی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەرستەی سەرەکیەوە بەدرێژی باس کردووە، هەروا لەسەر ئەوەش دواوم، کەئەم ئامرازە دەتوانێ چەند رستەیەکی تری شوێن کەوتوو بەرستەی سەرەکیەوە ببەستێتەوە لەناو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا، لەبەر ئەوە ناویم ناوە ئامرازی

گەیەنەری گشتی ...... بەم کورتە مێژووە سەبارەت بە نووسین لەبارەی ئامرازی سینتاکسیەوە لەزمانی کوردیدا توانیمان ئەوە بخەینە بەرچاو، کەچی لەم رووەوەنوسراوەو، ئەو هەوڵانەی، کە لێرەدا لەقەڵەم دراون چین وراستی ونا تەواویان چیەوچی باسکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لەم رووەوە نوسراوە دەمەوێ دووبارەی بکەمەوە، کەکارێکی هێجگار گرنگە لەرێزسان وزانستی زمانی کوردیداو خزمەتێکی زۆرباش دەکات.

## بەشی دووەم

## "ئامرازەکانی سینتاکسی"

لەم بەشەدا باسی زاراوەی ئامرازو پێناسینی ئامرازو ئامرازلە رووی دروستبوونەوەو ئامرازلەرووی ئەرکەوە دەکەین.

١- زاراوەی ئامراز

تا ئێستالەرێزمانی کوردیدا زاراوەی ئامرازبەوردی باس نەکراوە. کەچی دەگرێتەوە، هەروەک دیارە، کەوترا ئامراز جۆرەها شت وەپاڵ خۆی دەنێ .

وەک جاری وایەبەپێشگرو پاشگریش دەوترێت ئامراز، جگە لەوەی کەئامراز ناوە بۆهەندێ دەربڕین، کەدووڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە یان رستەیێک دەگەیەنێتەرستەیەکی تر هەروا بەوەش دەوترێت، کەناوی تاک دەکاتە کۆ، ناسراو نەناسراو، .... هتد.

ئامراز زاراوەیەکی باش هاتووە لەرێزمانی زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا،هەر بەتەنێ لە رێزمان نەچەسپاوە، بەڵکوو لەگفتوگۆوئاخاوتنیشدا بەکاردەهێنرێت. هەروەک کابرایەکی پینەدۆز بەبزمارو چەکوش وگازوشتەپێویستیەکانی

ـ تر دەڵێت ئامرازەکانی پێندۆزی.

هەندی کەس لەبریتی (ئامراز) دەڵێین، (ئامڕاز) هەر چۆنێک بێت وشەی ئامراز زۆر بەکار هاتووەولەسەرزا رسووکتر دێت لەوشەی (ئامڕاز) لەبەر ئەوەئێمە زاراوەی (ئامراز) بەکار دەهێنین نەک (ئامڕاز). لەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی، کوردیدا جۆرەها ئامراز هەن وەک ئامرازی: کۆ، ناسراو و نەناسراو، بچووککەرەوە.... هتد. ئێمە لەم کارەدا هەر ئامرازی سینتاکس باس دەکەین بەمەبەستی ئەوجۆرە ئامرازانە، کە دووڕستەپێکەوە دەبەستنەوەیان رستەیەک دەگەیەننە رستەیەکی تر.

(پێناسینی ئامرازی سینتاکسی)

ئامرازی سینتاکسی ئەو جۆرە ئامرازانەن، کەدوورستەی سادەبەیەکەوە دەبەستنەوە یان رستەیەکی شوێن کەوتوو (تابع) دەگەیەننەرستەی سەرەکی (اصلی) لەنێو رستەی لێکدراودا بەمئامرازانە دەوترێت ئامرازی سینتاکسی (ترکیبی) چونکە ئەوئەرکەی، کەجێ بەجێ ی دەکەن دەکەوێتە ناو قالبی سینتاکسەوە.

ئامرازەکانی سینتاکسیش ، کەئێمە لەم کارەدا قسەیان لەسەر دەکەین ئەمانەن : "ئێستا ، وە ، بەڵام ، ئەوسا ،بەڵکوو ،ش ، ئینجا ،یا ، ئەگینا ، وەکوو ، و ، کە ،بۆئەوەی کەچی ، تا ، چونکە ، ئەگەر ، بۆیە ".

ئامرازلەرووی دروست بوونەوە

ئامرازەسینتاکسی یەکانی زمانی کوردی لەرووی ساختمانەوە دەکرێن بە دوو بەش ، ،ئامرازی سینتاکسی سادە وئامرازی سینتاکسی لێکدراو .

١- ئامرازی سینتاکسی سادە :

ئەم ئامرازانە سادەن ولەیەک بەش پێکهاتوون. وبریتین لە .

( ئەوسا ،بەڵکوو ، وەکوو ،بۆئەوەی، کەچی، چونکە ،ئەگەر ).

ئەمانەش ئەو جۆرە ئامرازانەن کەلە دووبەشیان پتر پێکهاتوون وپێکەوە ئامرازی سینتاکسیان دروست کردووە . لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ئامرازە سینتاکسیەکانی لێکدراو ئەمانەی سەرەوەن کەباسمان کردن.

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە ،کە ئێمەناتوانین

لەمکارەدا بەتەراوی بچینەبنج وبنەوانی مێژووی، ئامرازەکانی سینتاکسی کوردی، بەڵکوو ئەوە پێویستی بە لێکوڵینەوەیەکی تایبەتیهەیە، کەئەم گیروگرفتەچارەسەر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین هەرچۆنێک بێت لە ئاست ئامرازە سینتاکسیە لێکدراوەکانەوە بدوێین وبە هۆی رواڵەتیانەوە بتوانین قەناعەتی ئەوە دروست بکەین کەئامرازەکانی سەرەوە لێکدراون وسادەنین، لێرەدا لەسەر هەرئامرازە سینتاکسیە لێکدراوەکان دەدوێین .

ئەوسا : ( ئەودەم- ئەوکات)

بەلێکوڵینەوەو وردبونەوە لەمئامرازە بۆمان دەردەکەوێت، کەئامرازێکی لێکدراوە، چونکە لەدووبەش پێک هاتووە . لە (ئەو) و (سا ). جا لێرەدا (ئەو )راناوی (ضمیر ) نیشاندانەبۆدوورە لەهەمان کاتدا راناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە - ( سومشخص مفرد ) ( سا )لە ساتەوە هاتووە کەواتای کات دەدات .بەشی (سا ) هەروا لە ( سات)ەوە کورت کراوەتەوە، ئیتر ( ئەو ) و (سا ) بەهەردووکیان ( ئەوسا )یان پێکهێناوەو لەرێزماندا دەتوانێ دووڕستەبەیەکەوە

ببەستێتەوە وەک :

کەریم هێندێک دانیشت ئەوسا دەستی کرد بەقسەکردن.

بەڵکوو :

لێرەدا دیارە ، کە ( کوو) بەشێکە لەدروستکردنی ئامرازی لێکدراوی (بەڵکوو ) . ( کوو) لەعاستی خۆیدا ئامرازێکی گەیەنەرەلەدیالێکتی کرمانجی سەرودا . ئەدم ، ئامرازد توانیو یەتی، کە زۆر ئامرازی لێکدراو دروست کات . لەبەر ئەوەی کە لەرێزمانی کوردیدا زۆر شت هەیە هەردوو دیالێکتەکە لێک نزیک دەکەنەوەوبەیەکی دا دەنێن جالەمانە ( کوو)ە . ئەمەهەرچۆن لەوێدا دەتوانێ ئامرازی لێکدراو دروستکات ئاواش لێرەدا دەتوانێ، هەبوونی ئەمەش سەرەڕای ئەوە وادەگەیەنێ کەلە دیالێکتی کرمانجی خوارووشدا ئامرازی (کوو) هەیە ، بەڵام لەوشوێنانەدا خۆی شاردۆتەوە وماوەتەوە . بەشەکەی تری ئامرازی مەبەست ( بەڵ)ە کەبەشێکی نادیارەو بێ واتایە . هەبوونی بەس بۆدروستکردنی ئامرازی ناوبراوە . بەوردبوونەوە لەم بەشە دەردەکەوێت لە ( بەڵام ) یان ( بەلآن)ەوە هاتبێت

پاشکەوتنی (ام)،(ان) لەیەکەم ودووەمدا ، ئەمەش بەڵگـەی قدناعەتی راستی تەواو ناگەینێ.

رەحمان زۆری خۆ ماندووکرد بەڵکوولە کارەکەی داسەرکەوێ وەکـوو :

ئامرازێکـی لێکـدراوە لەدوو بەش پێکهاتووە لـەبەشـی (وە) و بەشی (کوو).(وە) ئامرازێکی پەیوەستدارە لـەزمانـی کوردیدا - دوایی قسەی لەسەر دەکەین .( کوو) ئامرازێکـی گەیەنەری دیالێکتی کرمانجی سەرووەوبەشـداری لەدروسـت بوونـی (بەڵکوو) کردووە- بڕوانە بەڵکـوو- . هـەردوو ئامرازەکان ئامرازی لێکدراوی مەبەستیان دروستکردووە .

بـۆئـەوەی:

ئەمەشیان لە (بۆ)و (ئەوەی) پێکهاتووە- (بۆ)ئامرازێکـە بەکاردێت بۆوەپاڵ نان .(ئەوەی) لـەعاستـی خـۆیـدا لـە دوو بەش پێکهاتووە لە ( ئەوە )و (ی)- (ئەوە ) رانـاوی، نیشاندەرە بۆ دوور، بەڵام (ی) ئیزافەتە . لەخۆیدا (بۆئەوەی) ئامرازی(کە )شی لەگەڵ بووە ، بەڵام (کە ) لـەئـامرازەکەدا نەماوەو (ی) ئیزافەتی تێدا ماوە ، کە (کە )ی بـە ( ئـەوە )

دەبەستێتەوە .

کەچی:

ئەمئامرازە لەئامرازی گەیەنەر ( کە ) ورانازی نادیاری شت (چی) پێکهاتووە (کە) ئامرازێکی گەیەنەری زمانی کوردی یە ـ بەدرێژی قسەی لەسەر دەکەین ـ . (چی)رانازێکی نادیارە . هەروا دەتوانی ببێ بەئامرازی پرسیار ورستەی پرسیاری دروست کات .

چونکە :

ئەمەیان لە ( چون) وئامرازی گەیەنەر (کە) پێکهاتووە بەوردبونەوە لەبەشی یەکەمی(چون) دەردەکەوێت ، کەلە ( چۆن)ەوە هاتووە ، کەئامرازێکی پرسیارە لەپاشان پیتی (ۆ)ی بووە بە ( و ) و (چون) دروست بووە .

دیارە ـ چونکد زۆر باسمان کردووە ـ بەشی دووەمی چونکە کە (کە)ید ئامرازێکی گەیدنەرە وفرە بەکارهاتووە و زۆر ، بدشداری دروست بوونی ئامرازی لێکدراو دەکات هەرواش لێرەدا خۆی لەگەڵ(چون) لە (چونکە )دا رێکخستوەو ئامرازی گەیەنەری (چونکە ) دروست بووە .

ئــەگـــەر :

ئـەم ئامرازەش لەدووبەش پێکـهاتووە لـەبەشـی (ئە)و (گەر). بەڵگەش بۆئەوەی، کەئەمەئامرازێکی لێکدراوەئەوەیە کە (گەر)بەتەنها بەکاردێت وجاری واش هەیە ئامرازی نەفی ( مە ) وەردەگرێت و (مەگەر) دروست دەکات پیتەقالبی(ئـە)ش هەروەک دێتە پێش چاو بۆدووپاتی بەکاردێت. هێـزی ئـــەم ئامرازە بەپیتە قالبی (ئە) زیاترەلەوەی ، کە بەبێ ئـــەم پیتەقالبە....بێت . لەهەندێ گۆڤەرانی زمانی کوردیـــــدا ( هەگەر )یش هەیە . ئەمەوا دەگەینێ کە(ئە) جێگای (هـــە) ی گرتۆتەوە (ئە)ش لە(هەر)ەوە هاتووە وەک چۆن ( هـــەرکـــە ) هەیە. بەڵام لێرەدا پیتی (ر) کەوتوەو(هە) ماوەتەوە. هـەر بەمپێیەش (ئە)لە(ئەر)ەوە هاتووە پاش کەوتنی پیتـــی (ر). هەندی جار لەدیالێکتی کرمانجی خواروودا لەبریتی (ئەگەر) ( ئەر ) بەکاردەهێنرێت . لەدیالێکتی کرمانجـی ســەروودا (ئەر) بە(ئەگەر) واتا دەگەیەنێ وەک ئەو بەبڵاوی بـەکـار دەهێنرێت ...

" ئـــامراز لەرووی ئەرکەوە "

ئامرازە سینتاکسیەکان ، کەلێرەدا باسیان دەکەین ئەرکێکی زۆر گرنگیان هەیەکەبریتی یەلە پێکەوەبەستنەوەی دووڕستە یان پێوەستکردنی ڕستەیەک بە یەکێکی تر . جا بەپێی ئەمکارەی، کەئێمە لەبەر دەستمانە وتێیدا باسی ئامرازە سینتاکسیەکان دەکەین ، دەکرێن بەدووبەشەوە بەشی پێکەوە بەستنەوەی دووڕستە ، ئەمەیان پێیان دەوترێت ئامرازی سینتاکسی پێوەندی ئەوانەی ڕستەیەک بە ڕستەیەکی - تر پێوەست دەکەن پێیان دەگوترێت ئامرازی سینتاکسی پێوەستی . هەربەشە لەوانەدا ئامرازی خۆی هەیە وئەرکی تایبەتی جێ بەجێ دەکات .

کەواتە ئامرازەکانی سینتاکس لەرووی ئەرکەوە ئەکرێن بەدوو بەشەوە :

١- ئامرازی سینتاکسی پێوەندی .

٢- ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر .

بەشی سێهەم وچوارەمی ئەم کارە سەبارەت هەریەکەیانە .

# بەشی سێیەم

## " ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار ،پێوەندی"

لەم بەشدا باسی جۆرەکانی ئامرازی پەیوەستدارو پێوەندی جۆرەکانی ئامرازی پەیوەستدار دەکەین .

١- " زاراوەی ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار پێوەندی"

لەکتێبەکانی ڕێزمانی کوردیدا زاراوەی تریش هەیە بەکار دەهێنرێت بەهەمان مەبەست . هەروەک ماموٚستا سەعید سدقی کابان زراوەی عەتفی (عطف) بەکار هێناوە... ماموٚستا توٚفیق وەهبی (لێکدەر ، بەندی، یەک خەر )ی بەکاربردووە.... پرۆفیسور قەناتی کوردۆ- ک ـک - کوردۆیێڤ زاراوەی( پەف گریگ)ی بەکارهێناوە... ماموٚستا نووری عەلی ئەمین (پێ بەست )ی بەکاربردووە...ماموٚستا رەشید کورد (پێوەند )ی بەکارهێناوە....،ماموٚستا جگەرخوێن تیپی (پێوەند )ی بەکار هێناوە...، لیژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد زاراوەی (عطف) بەکارهێناوە....،

ئێمەلەم کارەدا باش دەزانین، کەزاراوەی پەیوەستدار بەکار بهێنین چونکە ئەم ئامرازانە پەیوەستی لەنێوان دووڕستەدا پەیدا دەکەن، بەمەوە توانای پەیوەستیان هەیە لەبەرئەوە ناویان دەبەین بەئامرازی پەیوەستدار ووشەی پەیوەستدار لەدوو بەشێک هاتووە لەبەشی ( پەیوەست)و بەشی (دار ). پەیوەست بەواتای پەیوەندی بەکار دەهێنرێت

بەشی (دار)ئامرازێکە بۆدروستکردنی دارێژراو بەکار دەهێنرێت هەروەک : سەردار ، عیلمدار ، زامدار ، خەزنەدار ... هتد. ئەم ئامرازە واتای هەبوون دەگەیەنێت ، کە (دارد)ی فارسی دەگرێتەوە ، واتای تێکڕای ئامرازەکە " ئامرازی پەیوەست هەیی"ە .

ئامرازەکانی پەیوەستدار لەزمانی کوردیدا ئەمانەن : ئێستا ،وە ،بەلام ، ش، ئینجا ،و ،یا ،ئەگینا ، ئەوسا ،بەلکوو وەکوو .

-٢-" جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار "

ئامرازەکانی سینتاکسی پەیوەستدار لەزمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا دەکرێن بەچوار بەشەوە :

١- ئامرازی پەیوەستداری پێکەوەبەستنەوە .

٢- ئامرازی پەیوەستداری عەتف.

٣- ئامرازی پەیوەستداری لێک جیاکەرەوە .

٤- ئامرازی پەیوەستداری هامبەریەک.

١- ئامرازی پەیوەستداری پێکەوەبەستنەوە :

لەم زمانەدا دووئامرازی پەیوەستداری پێکەوەبەستنەوە ،

هەن، کەبریتین لەئامرازەکانی:

( و ،ش ).

١- ئامرازی پەیوەستداری پێکەوەبەستنەوەی"و":

لێرەدا ئامرازی "و" کەئامرازێکی هێجگار باووبڵاوە وبەکارهاتووەو ئامرازێکی پەیوەستداریشدا ، دوورستەی سادە بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەستنەوەیەکی تەواو ،بۆنموونە :وەک

تۆهەتەتیغی دەبان

و

من هەمەتیغی زبان

فەرقی ئەم دووتیغەهەروەک ئاسمان وریسمان ( پەندکەریم ل - ٢٩) لەمرستەیەدا دیارە ،کە"و" هەردوو رستە سادەکانی ( تۆهەتەتیغی دەبان) ، (من هەمەتیغی زبان) پێکەوە بەستوونەتەوە بەستنەوەیەکی تەواو ، لەرستە پەیوەستدارەدا دوو فاعیل هەیەلەگەڵ دووفێعل، یانی بۆهەر رستەسادەیە فاعیل وفێعلی خۆی هەیە دەشبێ بۆهەردوورستەکەیە فاعیل هەبێ ودوو فێعل ، بۆنموونە :

ئافرەتێکی سەرەدڵی لەرزی

و

رەنگی زەرد هەڵگەڕا ـ (ک ژـ ث، ل ـ ۴)

تەما تەما سی بگری

و

تەرنەبی

قوماربا زیش بی

و

ئاخر شەرنەبی (پەند ـ کەریم،ل ـ ۴۷)

یان بەپێچەوانە لەرستەلێکدراوە پەیوەستدارەکەدا دوو فاعیل ویەک فێعل هەیە . بۆنموونە :

ئەوبێت بەکوڕی ئەم

و

ئەمیش بەباوکی ئەو ( ک ـ ژ ، ت ، ل ـ ۹۰)

لەمرستەیەدا ، کە رستەیەکی لێکدراوەی پەیوەستدارە فێعل لەرستەی سادەی دووەمدا نییە ، کەدەبوایە (ببێت)بۆ هەروەک دەبوو رستەسادەکە (ئەمیش ببێت بەباوکی ئەو ) لێرەدا فرمانی (ببێت ) نیە ،کە فێعلی رستەکەیەوماوەتە

(ئەمیش بەبا وکی ئـەو ) .

سەبا رەت کا تـی فێعلەکا نی ئەمرستا نەوە ،کەبەیا رمـــەتــــی ئا مرا زی "و"ی پەیوەستدا ر بەیەکەوە . دەلـکێن دەبینیــــن ، کەلەرستەکا ندا دیا رە ،فرما نی هەردوو رستەکا ن دەبێ لەیەک کا تدا بن ولەگەڵ یەک بگونجێن، لەرستەی لێکدرا وی پەیوەستد ـ ا ری، یەکەم فرما نی هەردوو رستەکا ن لەیەک کا تدا ن ، کـە هەرنووکیا ن کا تی ئێستا ن (هەتە ،هەمە )، کەلــەچــا . وکــــی (هەبوون)ەوە ها توون، هەروا لەرستەی لێکدرا وی دووەمیشــدا فرما نی هەردوو رستەکا ن لەکا تی را بردوو دا ن (هەلگـــەرا ، لـــەرزی ) .

لەرستەی لێکدرا وی پەیوەستدا ری سێیـەمیشدا کـــا تــــــی فرما نی دێری یەکەم لەنموونەکەدا لەکا تـی ئێستــــا دا ت ، فرما نی رستەی یەکەم موسبەتە وەی دووەم نەفی یە .

ئا مرا زی پەیوەستدا ری "و" دەتوا نێ دوو وشـــەپێـــکـــەوە بـبەستێتەوە بۆنمـوونە :

خەیا ڵی ئا ش ( و ) ئا شەوا ن جوێیە

هیچیا ن نا زا نن دا نیا ن لەکوێیــە ( پەندکەریم ـ ل ـ ٤٠ )

پارەی بەخشندە (و) ئاوی ناوبێژنگ

وەک پشکۆیە کەبکرێتەناوچنگ (پەند - کەریم، ل - ٤١)

ب - ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوەی "ش"

ئەمئامرازە دەتوانێ بەتەواوی دووڕستە بەیەکەوە ببەستێتەوە، بۆنموونە:

من عەیشانم خۆش ئەوی، ئەویـ

ش

منی خۆش ئەوێ (ئە - ک - ل - ٤٠)

ئامرازی (ش) لێرەدا ڕستەی (من عەیشانمخۆش ئەوی)و (ئەومنی خۆش ئەوێ) بەیەکەوە بەستوونەتەوە، لەم ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا هەر ڕستەیەفاعیل وفێعلیتایبەتی خۆی هەیە، مەرجە لێرەدا یانی بەیارمەتی (ش) ڕستەکان هەریەکە فاعلی خۆی هەبێت، بۆنموونە:

ئەویان بەکولنگ ئەرزی ئەکۆلی منیـ

ش

بەخاکەنازخۆلەکەیمدەرئەدا(ئە ،ک،ل -٨)

لەمڕستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا بۆهەرڕستەیەفاعیلی

تا یبەتی خۆی هەیە ، رستەی یەکەم وشەی (ئەویا ن) کەرا نـا وی جودا ی کەسی سێیەمی تا کەفا علی رستەکەیە . لەهی دووەمـدا وشەی (من) کەرا نا وی جودا ی کەسی یەکەمێ تا کە قا عیلـی رستەکەیە . هەروا لەمرستەلێکدەرا نەی، کـە ئـا مـرازی پەیوەستدا ری"ش" وەزیفە دەبینێ فێعلی رستەکـا ن لـەرووی کا تەوە خا سیەتی تا یبەتی خۆیا ن هەیە ، وەک بەزۆری فرما نـی هەردوو رستەکا ن لەیەک کا تدا دەبێ بۆنموونە :

هەندی ئا مۆژگا ری حەسەنیا ن کرد ، ئەوی

ش

بەسەر با دا نەود لەخەڵکەکە جیا بووەوە ،(ئەـ ک ـ ل ـ ١٢)

لەمرستەیەدا فرما نەکا نی" ئا مۆژگا ری کرد"و" جیا بووەوە" کەچـی رستەی یەکەم ودووەمن لەیەک کا تدا ن ، هـەردووکیا ن لەکا تی را بردوودا ن . هەروا هەردووکیا ن دەتوا نن لـەکا تـی ئێستا دا بـێ . بۆنمـوونە :

خەڵکی خۆیا ن لەمن کۆدەبنەوە ،ئەمنی

ش

قسەی را ستیا ن لۆدەکەم (ئەـ ک ـل ـ ١٥)

جاری وا دەبێ، کەکاتی فرمانی رستەکان رابردووبێ هەریەکەجۆرە رابردووێکە هەروەک لەمرستەی خوارەوەدا دیارە بۆنموونە:

ئەوچاوەروانی دەمی منی ئەکرد، منیش

چاوەروانی وتەیەکی کاریگەری تەڕوبڕبووم (ک ـژ، ت،ل٨٢)

لەمرستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا رستەی یەکەم فرمانێکی کاتی رابردووی بەردەوامە وشەی( ئەکرد )فرمانی رستەی دووەمفرمانێکی کاتی رابردووی دوورە وشەی(چاودڕ‌ان بووم )

مەرج نیە لەرستەلێکدراوە پەیوەستدارەکاندا یان لە هەموو رستەیەکی تردا پیتی (ش) هەبێ وەک ئامرازی پەیوەستدار ،بەڵکوو ئەمپیتە دەتوانێ ئەرکی ئامرازی دووبارە کردنەوەش جێ بەجێ بکات ،کە جێگای ( الفبا ) ی عەرەبی بگرێتەوە بۆنموونە:

ئەوئەچێ بۆماڵەوە ،ئەبێ منی( ش ) بچم بۆماڵەوە.

(ش) لێرەدا ئامرازەبۆ دووبارەکردنەوە بەکاردەهێنرێت و لەمرستەیەدا بۆئەمەبەکارهاتووە.

٢ـ ئامرازی پەیوەستداری عەتف:

لێرەدا هەرئامرازی (بەڵام) هەیە کەدەتوانێ رۆڵی عەتف بگەیەنێ، ئەمجۆرەبۆزۆر ئامراز ناوبراوە، کەهەموو ئامرازەکانی پەیوەستدار دەگرێتەوە. ئەوە لەرێزمانی کوردیدا زۆر بەرچاو دەکەوێ لەقسەکردن ونووسیندا.

بۆنموونە:

ئەمیرلێرەدا ویستی بدوێ،

بەڵام

هەرچی لەسەریابوو لەناکاوفڕی. (خ ـ ئا ـ ل ـ ٧)

رستەی لێکدراوی پەیوەستداربەیارمەتی ئامرازی پەیوەستداری عەتف (بەڵام) دەبێ لەدوومویتەدا یان فاعیل پێکهاتبێ، ئەمەش بەزۆری بەرچاو دەکەوێت. بۆنموونە:

دەمم هەڵ هێنایەوە وەرام بدەمەوە،

بەڵام

تەپەتەپی پێی وەستاو وەستاژن دەم کوتیکردم (ک،ژ،ت،ل ٨٢).

لەمرستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا فاعیلی رستەی یەکەم

(م)ە ، کەرا ناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە ، ئاعیلی دووەم کۆمەڵەفاعیلی (تەپە تەپی ، پێ ی وەستا وەستا ژن ).

شۆخی جوانی بەدرەوشت
وەک ژاڵەی ئاڵە تاڵە
بەلام
یاری خۆش سروشت
کانگەی کەماڵە ،ماڵە
من بێ دەنگ بووم وهیچ ئسەیەکی نرم پێ نەکرا ،
بەلام
ئەوکاتێک چاوی لەقوولایی ئاسمان داگرتەوەو
لای دانەسەرروخساری من (ک،ژ ، ت، ل، ٥١).

سەبارەت فرمانی رستەلێکدراوە پەیوەستدارەکان کەبە یارمەتی ئامرازی (بەلام) لێکدراون پێبوستە بزانین کە فرمانەکانی ڕستەکان دەبێ هەردووکیان لەیەک کاتدا بن یان لەکاتی لێک جیا ،جاری واهەیە هەردووکیان لەکاتی رابردوودا . بۆنموونە :

هێشتا منالْ بووم ،کەدایک وباوکمان ئەمری خوایان

بەجێ هێنـــا ،

بـــەلام

براکانم برابوون، لێمبێزارنەبوون وبەدەستمەوەوەڕەس ، نـــەبوون، ( ک ، ژ ، ت ، ل ، ١٥٨ ).

هەرواکاتە رابردوودکانیان لێک جیابن ، بـــۆنموونـــە :

ئافتاویش وەک هەموو رۆژانێ پیاڵەکانی ئامادەکرد ،

بـــەلام

بۆچی بەتایبەتی یەکێکیانی لەوەکانی ترباشتر ئەشـــــت

( ک، ژ ، ت ، ل، ٧٦ ).

فرمانی رستەی یەکەم "ئامادەکرد" فرمانێکی رابـــــردووی سادەیە ،فرمانی رستەی دووەم ( ئەشت ) فرمانێکی رابـــــردووی بەردەوامە . دەشبێ، کەفرمانەکانی رستەکان لەکاتی جیابـــن

بـــۆنمـــوونـــە :

راستـــە ، خـــوا زەلیلـــی کـــردووم

بـــەلام

ئەتوانم ،خۆم بژیەنم ( ک ، ژ ، ت ، ل، ١٥٨ ).

فرمانی رستەی یەکەم" کردووە" رابردووی ( کامیلـــــــد و

فرمانی رستەی دووەم کاتی ئێستایە " ئەتوانم"

ئەشزانم‌کەئێمەئەسرۆوەک زوربەی رۆژانی تر ،لەگۆشتی ،

چەورروو چەوریمان نەبووە ،

بەلاّم

هەرقایلم ( ک ، ژ ، ت ، ل ، ۶۴).

فرمانی رستەی یەکەم (نەبوو) رابردووی نەفی یە ،فرمانی رستەی دووەم کاتی ئێستایە ( قایلم).

۳ـ ئامرازی پەیوەستداری جیاکەرەوە ؛

ئەمەشبان لەزمانی کوردیدا هەرئامرازی( یا ) بۆجیا کردنەوە بەکار دەهێنرێت. هەندی جاربە ( یان) بەکار ، دەبردرێ نموونەبۆئامرازی "یا "

چەندی خەریکی ئاووگلّ ئەبووین

یا

بەسەربادا ئەهاتین ئەچوین

قسەهەزارە هەردووی بەکارە

وەکوئاوهاتین وەکووبا ئەڕۆین( پەندـ کەریم ،ل، ۱۰۸).

لەم رستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا ئامرازی (یا )

توانیویەتی رستەسادەکانی ( چەندی خەریکی ئاووگڵ ئەبوین) و(بەسەر بادا ئەهاتین ئەچووین) بەیەکەوە ببەستێتەوە ، ئامراز لێرەدا لەرووی واتا واتایەکی جیا کردنەوە دەدات بە دەستەوە ، هەروا لەرستەکەدا دیارە ، کەزوربەی ئەم جۆرە رستانەیەیارمەتی (یا ) یەک مویتەدای هەیە .

ئەم ئامرازە دەتوانێ دوو وشەیان دووکۆمەڵە وشە بەیەکەوە ببەستێتەوەلەناورستەیەکی سادەدا ، بۆنموونە :

تۆبەخێوناکەم بۆخەو وخواردن

( یا ) وەک هەندێ کەس بۆچاو شۆڕکردن

کورم نەتبیستووە مەشوورتر لەگشت

سەربۆسەربڕین نەک بۆسەرزەنشت ( پەند ـ کەریم ) .

ئامرازی "یا "ی ئێرەکۆمەڵە وشەی (بۆخەوە وخواردن)ی بە کۆمەڵە وشەی "وەک هەندێ کەس بۆچاو شۆڕکردن" بەستۆتەوە .

٤ـ ئامرازی پەیوەستداری هامبەری(؟ ) :

لێرەدا ئامرازی"ئەوسا" خۆی خستۆتەئەم قەوارە ،وەبەواتای هامبەری بۆئەومەبەستە لەواژەی "ئەوسا " کەلک وەردەگرین وەک :پشوویەکمدا ،

ئـەوسـا ،

روانيمە دەورو پشتم( خ، ئا ، ل، ٣٧).

لەم رستەيەدا ئامرازی (ئەوسا ) توانيوويەتی ،كەهـەر دوو رستەكانی (پشوويەكمدا )، (روانيمەدەورو پشتم)بەيەكەوە ببەستێتەوە ئەم رستانە يەک موبتەدايان هەيە ودووخەبەر كەفرمانەكانيان لەكاتی رابردوون . بۆنموونە :

سەرێ راوەستا ، وەكوو جارێكی تر بەخێرهاتنم بكات ،

ئـەوسـا

كـەوتەچاوگێران وەكووبيەوێ يەكێک ببينێ(خ،ئا ،ل، ٤١).

لەم رستەلێكدراوە پەيوەستدارەدا ئامرازی ( ئـەوسـا)ی پەيوەستدار واتای ( ئەوكات) دەگەيەنێ . لەزمانی كورديدا زۆرجار دووشەی (كات )،(سات ) دەگرێتەوە ، كەواتـە "سات " " كات "ە ، بەڵام پيتی "ت" لە "سات " دا نەماوە وزۆركاری، گفتوگۆو نووسين خستوويەتی وماوەتەوە "سا ". گـەلی جاری واش هەيە ، لەبريتی "ئەوسا " "ئەوجا " دروست دەبێ وبەكـار دەهێنرێت . بۆنموونـە :

كەبێ كلـی حوشتری بگاتە عـەردی ،

ئەوجا

ئەتووش دەبیە ئەفەندی (ئە،ک ل، ٣- ١).

لێرەدا "ئەوجا "لەبریتی ئامرازی "ئەوسا "بەکارهاتووەو، دوورستەی بەیەکەوە بەستوونەتەوە- "ئەوجا " لە " ئەو"و "جار" پێکهاتووە. وشەی"جا " یانی" کات - سات "، بەڵام لێرەدا پیتی" ر " کەوتووە، هەرچون پیتی "ت" لە " سات"ەوەکەوتبوو لەوێشدا ماوەتەوە"جا " بەواتای "جار"و"ئەوجا "دروست بووە.

هەندێ ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار هەن ، ناچنە پاڵ ئەو بەشانەی سەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامرازی سینتاکس پەیوەستدارن کەیەکەیەکەباسیان دەکەین :

ئامرازی پەیوەستداری یا ... یا

ئەمئامرازە یەکێکە لەئامرازەکانی سینتاکسی پەیوەستدار کەدوورستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە وواتای هەڵبژاردن ، دەگەیەنێ "اختیار" بۆنموونە :

ریگەیەکی تر بدۆزمەوە بۆنان پەیداکردن یاکۆڵ هەڵگری یا کرێکاریش بێت .                    ( ک،ژ، ت ، ل، ٦٩).

لەمرستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا ئامرازی "یا ... یا "

بەکارهاتووە ،کە توانیوویەتی رستەی" کۆڵ هەڵگری"کە رستەیەکی بێ خەبەرە بەرستەی "کرێکاریش بێت " ببەستێتەوە خەبەری رستەی یەکەم لەرستەلێکدراوە پەیوەستدارەکەدا هەمان خەبەری رستەی دووەمە .

هەندێ جاری ترواتای ئیحتیمال دەگەیەنێ. بۆنموونە :

گوللەپارچەقورقوشمێکە ولەشێوەی ناوکەخورمایەکدایە . . .
لەلوولەیەکی باریکەوە دەرئەپەری یانەی کری یاناى گرێ

( ک، ژ ، ت ،ل، ٧٢)

لەمرستەیەدا یەک موبتەدا هەیەو دووخەبەر ، خەبەری رستەی یەکەم موسبەتە ، بەڵام خەبەری رستەی دووەم نەفیە بە یارمەتی ئامرازی "یا "ی نەفی .

ئامرازی پەیوەستداری بەڵکوو :

بەڵکوو ئامرازێکی بەکارهاتوبلاوەلەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا . هەروا زۆربەکاردەهێنرێت بۆبەیەکەوە بەستنەوەی دوورستەی سادە ، بۆنموونە :

من قوتابخانەی شارەکەمانم تەواوکرد ، لەزانستگای بەغداش دەرچووم ، بەوەش نەوەستام ،

بەڵکوو

کۆتاییم بەزانستگایەکی ئەورووپاش هێنا (ئە،ک،ل،١٠۴)

لەم ڕستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا، کەبەیارمەتی ئامرازی "بەڵکوو" بەیەکەوە بەستراو نەتەوەیەک، موبتەدا ـ فاعیل ـ هەیەـ جاری واش دەبێ بۆهەر ڕستە سادەیە موبتەدای تایبەت هەیە. بۆنموونە:

ئەیویست، بۆیەکەمجار داخی دڵی بۆشلەشاریەبگێرێتەوە،

بەڵکوو

ئەمەخوایە ئەوباسەبچێتەسەرزبان ولێوێک

(خ ـ ئا ـ ل ـ ۴١)

لەم ڕستەلێکدراوە پەیوەستدارەدا، هەرڕستەسادەیەموبتەدای تایبەتی خۆی هەیە، موبتەدای ڕستەی یەکەم فاعیلێکی نادیارە بۆکەسی سێ یەمی تاک "ی" کەبەفرمانی"ئەیویست"ەوە لکاوە، بەڵام موبتەدا لەرستەی دووەمدا وشەی "باس".

جاری وایە دەبێ لەرستەی یەکەمدا راناوێک یان ناوێک هەبێت بۆپەیدا کردنی نسبەت لەنێوان هەردووڕستەسادەکاندا تابتوانێ بەئامرازی (بەڵکوو) کارخۆی بکات ـ ئەموا

دەگەیەنێ ، کەگەلێ جار " بەڵکوو " کاری خۆی دەکات ،
بەهەبوونی ئەمجۆرەناو ،تەناسوبیانە ناوە تەناسوبیەکان
بەزۆری دەربڕینی یان شەوی "تەنیا "نەوەکو "نە . بۆنموونە :

قارەمانی چیرۆکەکەم تەنیا ئایشەخان نەبوو ،

بەڵکوو

دلاوەریش بوو ،

(نە ـ ک ـ ل ـ ١٤١)

دەنگوباسی دۆزینەوەی ئەمگەنجینەیە نەوەکوو تەنیا لە
گەرەکی ئێمەدا بلاوبووەوە ،

بەڵکوو

بەرگوێ ی هەموودا نیشتوانی شارکەوت .

(ئە ، ک ،ل، ١٨).

لێرەتێبینی دەکرێت ، کەبەکارهێنانی ناوی تەناسوبی
"تەنیا "لەرستەی یەکەمدا دەبێ فرمانی هەمان رستە لە
حالەتی نەفیدابێتە بەلام گەر ناوی تەناسوبی "نەوەکوو "
بوو دەبێ فرمانی رستەی یەکەم لەحالەتی نەفیدابێت .بەلام
گەرناوی تەناسوبی "نەوەکوو " بوو دەبێ فرمانی رستەی

یەکەم لەحالّەتی موسبەتدا بێت . فرمانی هەردوو رستەکان دەبێ لەیەک کاتدا بن ـ بۆنموونە :

لەراستیدا کابرا ئەم وشەی تەنیا بەئێمەنەووت ،
بەڵکوو
هەمووکوڕەکانی ئەونا وە گوێ یان لێ بوو . (ئە ،ک،ل، ۹)

هەندێ جاریش وا رێک دەکەوێت ، کەفرمانی یەکەم فرمانی داخوازی وهی دووەم کاتی ئێستایە . بۆنموونە :

دڵ لەمیحنەت کەیلە ،
بەڵکوو
زوو دەرچم لەشار

ئیمڕۆ رۆژێکەلەجەمعی مەردوومان بگرم کەنار (پەند ـ کەریم ـ ل ـ۸۰)

ئامرازی پەیوەستداری وەکوو :

"وەکوو" یەکێکەلەو ئامرازانەی، کەدوو رستەی سادە بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، بۆنموونە :

ئاغاش بێ وچان ئاوری ئەدایەوە بۆی ئەخنایەوە ،
وەکوو

بیەوێ دڵ نەوایی (خ ـ ئا ـ ل ـ ١٩)

ئامرازی "وەکوو" وەنەبێ هەرتەنها دووڕستەبەیەکەوە ببەستێتەوە بەڵکوو سەرەرای ئەوەش دەتوانێ بەکار بهێنرێ وەک ئامرازی "وەک یەک" ئەمەش لە ڕەوانبێژی کوردیدا زۆرباش بەکاردەهێنرێ. بۆنموونە :

لەوڕۆژەهەستمکرد ، شتێک لەگیانما ئەبزوێت ،

وەکوو

منالێ لەدایک نەبوو ئەیەوێت بێتەدەرەوە .(خ،ئا ،ل،٤٣)

ئامرازی "وەکوو"ی یەکەم ئەرکی هەر تەنها لەبەیەکەوە بەستنەوەی دوو ڕستەیە ،بەڵام هی دووەم سەرەرای ئەمئەرکەی هەربۆ وەک یەکەو وەک یەکی پێشان دەدات . لەبەر ئەوە لە نێوان ئەم هەردوو ئامرازانەدا کورتە جیاوازیەک هەیە . ئامرازی یەکەم لەهی دووەم زۆرتر دەچێتەپاڵ قەوارەی، سینتاکسیەوە . ئامرازی وەکوو جاری واهەیە ، کەئامرازی نەفی "نە" وەردەگرێت . بۆنموونە :

شارەکەی ئێمەش خۆی ئامادەئەکرد ،

نەوەکوو

رۆژی لەرۆژان جەنگ بکەوێتەلای ئێمەشەوە. (ئە،ک،ل،٦)

نموونەی بەکارهێنانی ئامرازی "وەکوو" زۆرن هەروەک لە خوارەوە دیارن:

ئەم دەم ولچەمنی یە

وەکوو

شارستانیەکان بپارێمەوە. (ئە،ک ل، ٤٤)

هەرئەمەی وت،

وەکوو

گرێ ی زبانی کرابێتەوە،یان تینێکی نووری رژابێتە دەماریەوە. خ، ئا،ل، ٤١

ئامرازی پەیوەستدار "ئینجا":

ئامرازی پەیوەستداری ئینجا یەکێکە لەئامرازەکانی زۆربەکارهاتوو. بۆنموونە:

ئیتر گۆپانەکەی لەشانی دامالّی وبەکەمتەر خەمی یەکەوە، هاویشتی یە سووچێکی عەلافخانەکەوە،

ئینجا

کەوتەخۆتەکاندن لەوتۆزوخۆڵەی لەسەر جلەکانی

کەڵەکەبوو بوون .

( ک ـ ژ ـ ت ـ ل ـ ٦٥ )

ئامرازی ئینجا سەرەرای پێکەوە بەستنەوەی دوورستەی سادە بەیەکەوە واتای "لەپاشان"یش دەگەیەنێ . بۆنموونە :

دیارەسەرخەوێکی بۆئەشکێنن،

ئینجا

لەخەوهەڵئەسن ومیوەئەخۆن .( ئە ـ ک ـ ل ـ ٢٥ )

نموونەکان پێشانی دەدەن ، کەلەهەردوورستەکانی ئێرەدا دەبێ یەک موبتەدا (فاعیل) هەبێ. بۆنموونە :

چاوی کردەوە کەمێک تێی روانیم ،

ئینجا

ووتی: ئاخ خۆزگەپارچەزەویەکی خۆمم ئەبوو .

( خ ـ ئا ـ ل ـ ٤٤ )

لەم رستەیەدا فاعیل راناوی کەسی سێیەمی تاکەو بۆهەردوو رستەکان بەکارهاتووە . هەروانموونەکان ئەوە پێشان دەدەن ، کەدەبێ فرمانی هەردوو رستەکان لەیەک کاتدا بن، لێرەدا بەزۆری لەکاتی رابردوودا دەبن. بۆ

نموونە :

دووسێ جار ئەملاوئەولای ژوورەکەی کرد ، جگەرەیەکی داگیرساند ، ئینجا

بەتوورەیی یەوە ووتی: سووتاندم ،لەناومبرد .

(ئە ،ک ،ل، ١١٨)

ئامرازی پەیوەستداری "ئەگینا ":

ئەمەشیان لەئامرازی پەیوەستدارەکانەوزۆر بەکاردێت بۆنموونە :

بەس خوابکا منالەکانمان فێری کفرو زەندەقەنەکەن.

ئەگینا

چاکە ئەبێتە خراپە. ( خ- ئا - ل - ١٨)

دەروێش کاکەللا پیاوێکی خواناسە ، لەراستی دا هاتنی شاری تەنیا بۆئەوەیەنوێژی جومعەی لێ بکا ،

ئەگینا

بۆبازاروشتومەک کڕین حەمەدمستەفای کوڕی هەموو هەفتەیەک دێ بۆشار . ( ئە- ک - ل - ٢٣،٢٢)

ئەورستانەی کەبەیارمەتی " ئەگینا " بەیەکەوەدەبەسترێتەوە دەبێ بۆهەر یەکەموبتەدای تایبەتی هەبێ.بۆنموونە :

قوربان تۆباسی ئەم نوێژەت هێنایەناوەوە،

ئەگینا

نەمن نەتۆ هیچ کامێکمان نەچووین بۆنوێژ. (ئە،ک،ل، ٦٦)

وادیارە ئیشی چاک قەت لەتۆوە ناوشێتەوە،

ئەگینا

چۆن بەم ئاسانی یەلەداخستنی قوتابخانەیەک ئەدوێیت.

(خ، ئا، ل، ٢٨)

لەم هەردوورستانەی سەرەوەدا لەهەررستەیەکدا دوو موبتەدا هەیە: لەرستەی یەکەمدا موبتەداکان وشەکانی "تۆ، ئەمن، نەتۆ" موبتەدان وەلەهی دووەمدا وشەی "ئیشی چاک" و راناوی لکاوی کەسی دووەمی تاک، کەلەفرمانی "ئەدوێیت" دا دیارە،

ئامرازی پەیوەستداری "وە"....

"وە" ئامرازێکی پەیوەستدارەولەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. بۆنموونە:

ئەمەیەکەمین جاربوو، کەحاجی برایمم، ئەدی،

وه

دوا جارم بوو ، کەهێلکەم لەدا پیرەئا یشێ کڕی.

(ئەـ ک ـ ل ـ ٨٦)

کا برا شێتۆکەیە ، بەسا ویلکەی ئەم کردەوانە ئەکاو ،

هیچیشی لەبا را نی یە ،

وه

نا توانێ کا رلەخەڵکی بکا (ئەـ ک ـ ل ـ ٥)

ئەڵڵا بەرەکەت یا خوا هەمووڕۆژی کوێخا کەریمکوڕی بێ،

وه

کوێخا رەحیمیش کچ. (ئەـ ک ـ ل ـ ٢٩)

کوێخا کەریم بریا ری لەسەرهەمووشتێک ئەدا ،

وه

هەمین وئەستیش وەکوودووخوشکی ژنی ئەمدووبرایە

تێکەڵی هیچ کەین وبەینێک نەئەبوون. (ئەـ ک ل ـ ٣٠)

ئامرازی پەیوەستداری ئێستا :

ئەمەدیان هێجگار زۆر کەمبەکار هاتووە لەزمانی ئەدەبی

ئیمڕۆی کوردیدا ، سەرەتای واتای کاتیش دەگەیەنێ

بـــۆنمـــوونـــه :

ئەوما م قیتەلەسەرەتا دا چەند رقی لەمنا ڵەبوو ،

ئێستــا

سەدوو بگرەهەزا ر ئەوەندەش خۆشی ئەوێ.

( ک ـ ژ ـ ت ـ ل ـ ٩٥)

رستەی لێکدرا وی پەیوەستدا ر ، جا ری وا هەیە دروست دەبێ

بەبێ هەبوونی ئا مرا زی پەیوەستدا ر لێرەدا تەنها بەکۆما

( فا ریزە ) " ، " بەیەکەوەدەبەسترێنەوە . بۆنموونە :

قسەی کورت درێژ مەکە ،

رێگەی نزیک دوور مەکە ،پەند ـ کەریم ـ ل ـ ١٠٨ )

ئەمجۆرە رستا نە دەبن یەک موبتەدا بن ودوومو بتەدا یی بــــن

بـــۆنمـــوونە :

ئـــەچمـــەشـــا رێ کـــەس نـــەمنـــا ســی

خۆمهەڵئەکێشم پڕ بەکرا سێ.

( پەند ـ کەریم ،ل،٤٣)

لەمرستەیەدا فا عیل را نا وی لکا وی کەسی یـــەکـــــەمـــــــی

تا کە "م" کەبەفرما نی "ئەچم"و "هەڵئەکێشم"ەوەلکا وە .

**باران ببارێ ئاشم ئەگەڕێ**

**باران نەبارێ جووتم ئەگەڕێ**

( پەند کەریم - ل - ٤٩ )

لەم رستەیەدا دوو موبتەدا هەیە ؛ موبتەدای رستەی یەکەم وشەی " ئاشن " ە و هی دووەم ووشەی "جوُت " ە ٠

فرمانی رستەکان بەزۆری لە یەك کاتدا دەبن چ هەردووکیان لە کاتی ئێستادەبن یا لە کاتی رابردوو ٠ بۆ نموونە :

**بەخاڵۆ هات بەلامەوە**

**بوو بەمژدیها دای بەپامەوە**

(پەند : کەریم - ل - ٥٤ )

فرمانی رستەی یەکەم " هات " کاتی رابردووە و فرمانی دووەم " دا " کاتی رابردووە٠

**دۆست ئەوەیە ئەمگریەنێ**

**دوژمن ئەوەیە ئەمکەنێنێ**

( پەند . کەریم )

هەر دوو فرمانەکان لە کاتی ئێستادان وەك " ئەمگریەنێ " و " ئەمکەنێنێ " ٠

## بەشی چوارەم

## "ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر"

لەم بەشەدا ،کەبەشی چوارەمی کارەکەیە باسی زاراوەی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر وجۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر دەکەین.

### ١-"زاراوەی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر"

زاراوەی گەیەنەر لەبەشی "گەیەن" وئامرازی "ەر" پێکهاتووە. ئەمەلە رووی دروستبوونەوە وایە. لەلایەن رێزمان نووسانی کوردەوەئەم زاراوەیە بەکار نەهاتووە. لەلای مامۆستا حەسەن ئەحمەد حەسەنەوە.... بەکارهاتووە مامۆستای بەرێز ئامرازەکان بەئامراز ناونابات ، بەڵکوو ناویان بەراناو دەبات هەرچەندە رانانین وئامرازن....، بەلآم ئێمەوا بەباش دەزانین ،کەزاراوەی "گەیەنەر" بەکار بهێنین ،چونکە ئەمزاراوەیە لەهەمووزاراوە بەکار هاتووەکانی تر جێگیرترە. ئەمزاراوەیە لەچاوگی "گەیاندن"ەوەهاتووە .بەمەبەستی گەیاندنی شتێک بەشتێکی ـ ترەوە ، وەک گەیاندنی رستەیەک بەرستەیەکی تریان بەواتایەکی تر وەک گەیاندنی رستەی شوێن کەوتووبەرستەی

سەرەکی لەنێو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا .

**٢- " جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر "**

لەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ئامرازی گەیەنەرچەند جۆرێکی هەیە ، ئەمانەش وەک هینەکانی خوارەوەن:

" کە ، بۆئەوەی، کەچی ،تا ، چونکە ، ئەگەر ،بۆیە ،".

**ئامرازی گەیەنەری " کە "،**

ئامرازی گەیەنەری(کە ) لەرووی ئێتمۆلۆزیەوە دەگەرێتەوە سەر بناغەی پرسیاردار ی "کا "،" کێ = " ی فارسی کۆن .

لەراستیدا ئەمئامرازە دەگەرێتەوەسەر فۆڕمی راناوی خۆیی حالّەتی کراو "مەفعوولی"ی "کەهیە " کەلەئاڤێستادا ، "کەهیا " دەگرێتەوە، هەرئەویشە ، کەزۆر بەباشی بەکار دەهێنرێت . هەروا دەگەڕێتەوەسەربناغەی بنجی راناوی نادیاری "کەشجی"،" هەرکەس"" کەسێک". ئەمانەی، کە لێکۆڵینەوە دەکەن، گەیشتوونەتە ئەوە ، کەئەم ئامرازە لەزمانی فارسی کۆندا وەکوو راناوی کەسی بووەوبەکاریان دەبرد بەناوی "نوقام" ئەمەش وەک دەربڕینێکی بچووککراو بەخشە دەکەوێتە پێشی بۆتەواوکردنی واتاکەی وفراوان

کردنەوەی. لەفارسی کۆندا "کە" وەک راناوی نسبەتدا ربەکار نەهاتووە ، بەلآم هەر لای زانایانی زمان دیار دەکەوێ کەئەمئامرازە پرسیارەنا دیارەونەناسراوە ، کەفۆرمی "کا ، کێ"ی هەبووە ووردەووردە لەزمانی فارسیدا لەگەڵ " کو" بەکارهاتووەو بەفراوانی بەدیارکەوتووە . لەرووی سینتاکسیەوە وەک وشەی پرسیارو ئامرازی گەیەنەری رستەکان بەیەکەوە بەکاردێت ،ئەموشا نەبۆ دروست کردنی فۆرمی رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز زۆر بەکارهاتن ، کە دەیانتوانی جۆرەها رستەی شوێن کەوتووبگەیەننە رستەی سەرەکی، وشەی "کێ" دەتوانرێ بەکاربهێنرێت وەک راناوی پرسیارونسبەتدار "کێ" دەکەوێتە دوای ناوی گیانداروبێ گیان .

وشەکانی " کا ،کو" بەفراوانی وەک ئامرازی گەیەنەر بەکار دەهاتن ئەموشا نەووردەووردە بەپێی رۆژگار واتای وشەیی خۆیان ون کرد .

لەکاتێکی زووی زمانی فارسی نوێدا دەوری راناوی ، نسبەتدار "کی" وئامرازی " کا ،کو" دێتەپێشەوە ،لەسەرەتاوە

لەرۆڵی ئامرازی " کی" دەوری دەگێرا ، کەهەر وەکوو ئامرازی گشتی وەستاومایەوەو وەک راناوی نسبەتدار بەکارهات لەگەڵ ئەوەشدا لەزمانی دانیشتوانی ئەسفەهان هەر وەک م، یەخەر لەکتێبەکەیدا ( سبک شناسی یا تاریخ تطور نثرفارسی (سەملی) (آ) تهران ۱۳۳۱ل، ۲۰۷( محمدتقی بهار ـ ملک الشعراء) دەڵێت ، کەتا ئێستا ئامرازی گەیەنەر"کو"..... ماوەتەوە هەروا لەهەندێ سەرچاوەکانی تازەدا لەگەڵ "کێ" "کو"ش بەکاردێت . هەروەها بەهار دەڵێت بوونی " کی " بە " کە " دەگەڕێتەوە سەدەی (۹)ی کۆچی یا نزیکی سەدەی نۆیەم، هەروا هەرلەمسەدەیە " کی" ماوەتەوە، بۆیە بەکارهێنانی وەک پرسیار ولەگەل ئەودا "کاە"بەکاردێت بەکار هێنانێکی لابەلای،وە بەتایبەتی لەزارگۆنەدا ، هەروەها بەهاری بەڕێز دەڵێت ،کە" کە " لەکۆندا هەمیسان بەواتای "هرکس" " هەر کەس" بەکارهاتووە ، بۆنموونە :

خدا را ندا نست وطاعت نکرد

کەبربخت وروزی قناعت نکرد

هەمان دێربە "هرکس" واتاکەی ناگۆڕی بۆنموونە :

خدا را ندا نست وطاعت نکرد

هرکس بربخت وروزی قناعت نکرد " دانەر "

لەبەرهەمی کلاسیکی دا ئامرازی "کە" وەک "کجا"دەتوانرێ بەکاربهێنرێت . گەلێ جار لەبەرهەمی ئێستاشدا بەکاردێت دەشتوانرێ وەک ئامرازی گەیەنەری بەکاربێت بەتایبەتی لەزمانی فارسیدا . بۆنموونە :

یکی خوب چهره پرستنده دید

کجا نام او بود گُرد آفرید (فردوسی شاهنامە )

ئامرازی "کە" لەزمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیشدا هەیە و وەک ئامرازی "گەیەنەر"بەکاردێت ـ ئەمئامرازە لەم زمانەدا هێجگار باو وبلاوەوبەکارهاتووەبۆنموونە :

....... کەچی ئێستا دوای چارەکەسەعاتێک ،دوای هێندەی، کە

تەنها بگاتە خەستەخانەوبێتەوە ،وەک پەیکەرێک لەبەر دەممدا ئەچەقێ، ئەڵێ:ـ مرد... ( ک ـ ژـ ت ـ ل ـ ٤٧)

ئامرازی "کە"ی گەیەنەر دەتوانێ جۆرەها رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەکی لەنێو رستەی لێکدراوی

شوێن کەوتووخوازدا ،وەک رستە شوێن کەوتووەکانی:موبتەدایی خەبەری ، بەرکاری،کاتی، دیارخەری، ئامانجی ومەرجی و روون کەرەوەیی ....،

١- ئامرازی "کە" رستەی شوێن کەوتووی موبتەدایی ددگەیەنێتەرستەی سەرەکی :

دیارە،

کە

دەوران ئەبلە پەرستە

هۆشیارودانارووی لەنووشوستە. (پەند- کەریم- ل ٨٤)

لەمرستەلێکدراوە شوێن کەوتووخوازەدا ئامرازی " کە " رستەی " دەوران ئەبلە پەرستە"ی گەیاندۆتە رستەی سەرەکی، کەرستەیەکی شوێن کدوتووی موبتەدایە :

٢- ئامرازی گەیەنەر "کە" رستەی شوێن کەوتووی خەبەری دەگەیەنێتدرستەی سەرەکی:

بەخێر نۆزدەسالێت تەمەنەوهێشتا بەوەت نەزانیوە،

کە

چای شیرین مانای خۆشەویستییە(ک،ژ ،ت،ل، ٧٩)

هەستی بەوەکرد،

کە

پێویستە قسەیەک بکات. ( خ، ئا، ل، ٢٥)

من خۆم بەوە ئەزانم،

کە

ئاوەها ملت ئەشکێنم بۆخوارەوەودۆزەخت نیشان

ئەدەم. ( ک،ژ، ت، ل، ٨).

لەمهەرسێ رستانەدا رستەکانی (چای شیرین مانای خۆشەویستی یە،پێویستە قسەیەک بکات، ئەوەها ملت ئەشکێنم بۆخوارەوەو دۆزەخت نیشان ئەدەم) رستەی شوێن کەوتووی خەبەرین وبەیارمەتی ئامرازی "کە"ی گەیەنەر گەیشتوونەتە رستە سەرەکیەکان.

٣ـ ئامرازی "کە" رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی:

ئەوساتە بڕوای هێنا،

کە

ئەگەر برا لەپشت برا بێ،ئەوەخوشکییش بۆ،

رۆژی خۆی لەبرا زۆرترە      (خ،ئا ،ل،٦،).

ئێستەش ئەبینم ،

کە

ئەوعەهدەی لەبیربردۆتەوە

ئەوگرێەی بۆمن لەدڵیا بووهەمووی نیشتۆتەوە ،

(پەند ،کەریم ،ل،٤٩)

هەوڵم ئەدا تێی بگەیەنم ،

کە

تەنها بۆمەشق کردن ئەچین

(ک، ژ ، ت ، ل ، ٦٩)

لەم‌سێ رستەلێکدراوە شوێن کەوتووخوازانەدا رستەکانی (ئەگەر برالەپشت برابێ، ئەوە خوشکیش بۆرۆژی خۆی لەبرا زۆرترە ،ئەوعەهدەی لەبیربردۆتەوە ، نەنها بۆمەشق کردن ئەچین)رستەی شوێن کەوتووی بەرکارین وەڵام‌لەسەرپرسیاری چی؟دەدەنەوە بەیارمەتی ئامرازی "کە"ی گەیەنەر گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی.

٤ـ ئامرازی "کە" رستەی شوێن کەوتووی کاتی دەگەیەنێتە

رستەی سەرەکی.

کە

خەزاڵ لەدایک بوو، هێشتا کاوڕسەرنەبڕا بوو

کە

تەزووی ئازاری ئەشکی

بەباوێشکی ........

ئەچێتەوەدۆخی جاران

وەک نەبای دیبێ ونەباران. (پەند، کەریم، ل، ٤٦)

لەبەر ئەوە زۆرجار،

کە

چاخانەکەی چۆڵ ئەبوو. ئەها تەلام.

(ک،ژ، ت، ل، ٥٨)

لەم سێ رستە لێکدراوە شوێن کەوتوو خوازانەدا رستەکانی (خەزاڵ لەدایک بوو، تەزووی ئازاری ئەشکی بەباوێشکی...، چاخانەکە چۆڵ ئەبوو) رستەی شوێن کەوتووی کاتین و وەڵام لە سەرپرسیاری "کەی؟" دەدەنەوە وبەیارمەتی ئامرازی "کە" گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی.

٥ـ ئامرازی "كە" رستەی شوێن كەوتووی دیارخەریدەگەیەنێتە رستەی سەرەكی:

تا دوێنێش لەشەرموتەریقی یا ئارامم لەبەر ئەبڕاو جێگەم بەخۆمنەئەگرت، كەچی بێ ئارامی ئەڕۆم، ئەنجامی ئەوئەفسانەوی یەیە،

كە

گیان وهۆشمی هێناوەتەجۆش وخرۆش

( ك، ژ، ت ،ل،٧٦ )

بەردێك ،

كە

نەزان بیخاتەناوئاو

دەرنایە بەسەد عاقڵی بەناو . ( پەند،كەریم،ل،٥٥)

لێرەشدا رستەكانی "گیان وهۆشمی هێناوەتە جۆش وخرۆش ، نەزان بیخاتە ناوئاو )رستەی شوێن كەوتووی دیارخەرین و،وەڵام لەسەرپرسیاری (كامە؟) دەدەنەوەو بەیارمەتی ئامرازی "كە" گەیشتوونەتە رستەی سەرەكی....،

٦ـ ئامرازی "كە" رستەی شوێن كەوتووی ئامانجی دەگەیەنێتە

رستەی سەرەکی.

تەنها ئەموتەیەبەس بوو بۆئەوەی

کە

ئافتاولەوپەڕی مەبەستمتێ بگات .

( ک ،ژ ، ت، ل ۸۲)

بەزگی برسی وبەزگی تێرین

لێما ن ناگەڕێن،

کە

خۆش رابوێرین . (پەندکەریم)

لێرەشدا رستەکانی ( ئافتاولەوپەڕی مەبەستم تێ بگات ،

خۆش رابوێرین)رستەی شوێن کەوتووی ئامانجین.

۷- ئامرازی "کە" رستەی شوێن کەوتووی مەرجی دەگەیەنێتە

رستەی سەرەکی.

هەرشوێنی،

کە

ئاو گرتی ئاوایە

دێمەکارکێلان رەنجی بەبایە (پەندکەریم.ل،۴۳)

کە

پشیلەی راوکەر لەماڵانەما

مشک ئەکەوێتەنلیلی وسەما ( پەندکەریم.ل،٦١)

کە

دوژمنت کەوت.

تۆپێی پیامەنێ

زەبوون کوژمەبەلای خوالا مەنێ (پەند،کەریم،ل،٥٩)

لێرەدا رستەکانی "ئاوگرتی وایە، پشیلەی راوکەرلە ماڵانەما ،دوژمنت کەوت ) رستەی شوێن کەوتووی مەرجین وبە یارمەتی ئامرازی گەیەنەر " کە " گەیشتوونەتەرستەی سەرەکی ئامرازی گەیەنەری "کە"ی ئێرە جێگای ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر"ی گرتۆتەوە،

١ـ ئامرازی "کە" رستەی شوێن کەوتووی روون کەرەوەیی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی.

وامئەهات بەبیرا،

کە

ئیترلەسەیرکردنی تێرنەبم.( ک،ژ،ت، ل،٨١)

خۆ دەروونیشم جۆشێکی وەهای سەندبوو،

کە

ئەتووت (ئاگری نەورۆزی)تیا کراوەتەوە

(ک،ژ، ت، ل، ٨١)

ئەمڕۆ وا هەست بەخۆم ئەکەم،

کە

هێزێکی ئەفساناوی لەناخی دڵ ودەروونمارەگی داکوتاوەو

ئارامی لەبەربڕیووم. (ک،ژ، ت، ل، ٧٥)

لەم رستەلێکدراوانەدا رستەکانی (ئیترلەسەیرکردنی تێرنەبم، ئەتووت ئاگری نەورۆزی تیا کراوەتەوە،هێزێکی ئەفسانا وی لەناخی دڵ ودەروونما رەگی داکوتاوە وئارامی لەبەر بڕیوم). رستەی شوێن کەوتووی روونکەرەوەیین وبەیارمەتی ئامرازی "کە" گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی.

**٢- ئامرازی گەیەنەر "بۆئەوەی":**

ئامرازی بۆئەوەی یەکێکەلەئامرازەگەیەندرەکان، کە دەترانێ رستەی شوێن کەوتووی بگەیەنێتەرستەی سەرەکی بۆنموونە:

کاکە سووروعەیشا ن پێ یەکیا ن کردبەدوو ،

بۆئــەوەی

دوا نەکەون (ئە ،ک،ل،٢٩)

لەمڕستەیەدا ئا مرا زی "بۆئەوەی" توا نیویەتی رستـەی شوێن کەوتوو ،" دوا نەکەون" بگەیەنێتەرستەی سەرەکی کاکە سووروعەیشا ن پێ یەکیا ن کردبە دوو ) لەرستەی لێکدرا وە شوێن کەوتوو خــوا زەکـەدا .

ئا مرا زی (بۆئەوەی)ی گەیەنەر وا تا ی (تا ،تا وەکوو ،هەتاکوو)ش دەگەیەنێ .بۆنموونە :

بەرا ستی زۆربە پەرۆش بووم ،

بۆئــەوەی

ئەوپیا وەببینم . ( خ، ئا ، ل ٤٠)

لەمڕستەیەدا دەتوا نین لەبریتی "بۆئەوەی"ئا مرا زەکا نی ( تا ، تا وەکوو ،هەتا کوو ) دا بنێین بێ ئەوەی وا تـا کـەی بگــۆڕێ، بـۆنمـوونە :

بەرا ستی زۆر بەپەرۆش بووم ،

تــا

ئەوپیاوە ببینم .

بەراستی زۆر بەپەرۆش بووم ،

تا وەکوو

ئەوپیاوەببینم .

بەراستی زۆر بەپەپەرۆش بووم ،

هەتاکوو

ئەوپیاوەببینم .

ئەورستەیەی کەئامرازی "بۆئەوەی"ی گەیەنەر دەگەیەنێتە ،
رستەی سەرەکی، شوێن کەوتووی ئامانجی یە . بۆنموونە :

هەندێکیان چووبوونەسەرپەرژینی قوتابخانەکەی ئێمە و
باخچەکەی یانەی فەرمانبەران،

بۆئەوەی

بەباشی چاویان بەخاوەن شکۆبکەوێ

( ئە ، ک ، ل ٥٦)

رستەی ( بەباشی چاویان بەخاوەن شکۆ بکەوێ)رستەیەکی
شوێن کەوتووی ئامانجیە . رستەی شوێن کەوتووی ئامانجی لە
زمانی کوردیدا زۆرن. بۆنموونە :

ئیستگەی بێ تەلی لەندەن وبەرلین بوو بوونە نەزرگای

ئەوخەڵکە ، بۆئەوەی

گوێ لەهەواڵی جەنگ بگرن. (ئە،ک )

لەمجۆرەرستەلێکدراوە شوێن کەوتوو خوازانە دا فرمانی

رستەی شوێن کەوتوو ناتوانێ لەیەک کاتدابن ،بەڵکووهەردەم

لەکاتی جیا جیا دەبن. بۆنموونە :

ناوەناوەبۆمەشق کردن شەیپوڕلێ ئەدرا ،

بۆئەوەی

خەڵکەکە دوکان وبازار دابخەن وخۆیان لەنزیکترین

جێگەی خۆشاردنەوەدا بشارنەوە .

فرمانی (لێ ئەدرا ) لەسیغەی مەجهول ـ شاراوە ـ دایە

بەڵام فرمانەکانی ( دابخەن، بشارنەوە ) لەسیغەی فرمانی

مەنسووب دان.

ئامرازی گەیەنەر" بۆئەوەی "دەتوانێ بکەوێتەپێشەوەی

رستەوناوەڕاستی رستە . بەڵام بەزۆری دەکەوێتەناوەوەی ،

رستە . بۆنموونە :

گەلێ کەس هەتا ئەوانەی رێگاشیان بەبەردەرگای سەردا

نەبوو پیاسەیەکی ئەو ناوەیان ئەکرد،

بۆئەوەی

سەروسوراخێکی ئەڵەمان کوردی بزانن . (ئە،ک،ل ٦)

لەمرستەیەدا ئامرازکەوتۆتە ناوەوەی رستەهەروادەشتوانێ بکەوێتەپێشەوەی. بۆنموونە:

بۆئەوەی

دەرگای گفتوگۆی والا بکەمەوە،

هیچمنەدۆزیەوە . (خ،ئا ،ل،٢٨)

ئامرازی گەیەنەری "کەچی"

ئەمئامرازدش لەزمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا دەتوانێ رستەی شوێن کەوتووبگەیەنێتەرستەی سەرەکی .بۆنموونە:

بەشەووبەرۆژ لەژێر رەهێڵەی بەفروبارانا لەژێرقرچەی هەتاوا توانا بنێژە، هێزبڕێژە،

کەچی

هەمووی بۆئاغابێت . (خ، ئا ، ل ، ٤٤)

لەمرستەلێکدراوەشوێن کەوتوو خوازەدا ئامرازی"کەچی" سوانیویەتی رستەی شوێن کەوتوو ( هەمووی بۆئاغابێت )

بگەینێتەرستەی سەرەکی . بەمجۆرە رستەشوێن کەوتووانە دەوترێت رستەی شوێن کەوتووی ناچارەیی . بۆنموونە :

لەمسەرباسی خیزانەکەمم لەمێشکمدوور ئەختەوە ،

کەچی

لەوسەربەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم پیایا ئەچوومەوە .

( ک، ژ ، ت ، ل، ٧٥)

لەمرستەیەدا رستەی ( لەوسەربەبێ ئەوەی بەخۆمبزانم پیایا ئەچوومەوە ) رستەیەکی شوێن کەوتووی ناچارەیی یە .

فرمانی خەبەری هەردوورستەکان لەمجۆرەرستانەدا دەتوانن لەیەک کاتدابن یا لەکاتی لێک جیا ،بۆنموونە :

تەنها بۆنان خواردن ئەهاتمەدەرەوە ،

ئاخری هەرتووشیش ئەبووم .

لەمرستەیەدا فرمانی خەبەری رستەی سەرەکی فرمانی " ئەهاتمە "یەو فرمانی خەبەری رستەی شوێن کەوتووفرمانی "ئەبووم"ە هەردووکیان لەکاتی رابردووی بەردەوامن .

فرمانەکان دەتوانن لەکاتی ئێستادابن. بۆنموونە :

بەقورم گرت تائیبلیس وجنۆکەکانیش بەرەمەزان خۆیان

ئـەشـا رنـەوە ،

کـەچـی

ئێوەبەنا خێرتا ن وا زنا هێنن. ( خ،ئا ،ل،٥٦).

لای ئێمەکردنەوەی قوتا بخا نەیەک چەندگرا نە ،

کـەچـی

دا خستنی چەندئا سا نە ،بەرا ستی ئەمەنەگبەتی یە .

( خ، ئا ، ل، ٢٩)

هەروا دەبێت فرما نەکا ن لەکا تـی جیا بن .بۆنموونە :

ئەوفەرموویەتی خرنـی یە ،

کـەچـی

ئێمەئەڵێین خرە . ( خ،ئا ، ل، ١٩)

فرما نی رستەی سەرەکی لەکا تی را بردوودا یە ،بەڵامفرما نـی رستەی شوێن کەوتوو لەکا تی ئێستا دا یە . شوێن ئـا مـرا زی گەیەنەر " کەچی" لەرستەی لێکدرا وی شوێن کەوتوو خـوا زدا ، هەر نا وەرا ستی رستەکا نەو دەکەوێتەنێوا ن رستـەی شـوێن کەوتوو وسەرەکی . بۆنموونـە :

خوا عـەیبـی بزنـی ختووەتەروو ،

کــەچــی

کـــلاوی کردووەبۆبەرو .

ئەبێ دەست ما چ کەن، کەلەدێ یەکی وەها دووردا قوتا بخانە

کــرا وەتــەوە،                    کـــەچـــی

هەربا وکەومنا لەکەی نا نێری،هەربا وکێکی ترەبەهـــــا نــــــە

ئــەدۆزیتەوەو کوڕەکەیدەرئــەهێنی. ( خ،ئا ، ل، ٢٧ )

پەلامار م دا یەکەمێکی بکــوتم،

کــەچـــی

ئەو شەیتانە وەک کەروێشکێک لەژێر چنگما قەڵەمبــازی داو،

بۆی دەرچــوو . ( ک، ژ ،ت ،ل، ٩٤).

هەموو رۆژێک ئەمکردەوەیەم لەئا فتا وئــەدی،

کــەچــی

جارێک سەرنجم بوئەوە نەچوو ،لەخۆمبپرسم: " ئەدی ئـــەمـــە

بۆچی ویانی چی" .

**ئامرازی گەیەنەر"تـــا ":**

"تا " ئامرازێکی گەیەنەرە لەزمانی ئەدەبی ئیمـــــــڕۆ ی

کوردیدا ، دەتوانێ رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستـــــەی

سەرەکی لەناورستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا .ئەم ئامرازەلەرووی واتاوە دووجۆرە یەکێکیان واتای ئامانج دەدات ،بەمەوە رستەی شوێن کەوتووی ئامانجی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی .... ئەوی تریان واتای پێوان وئەندازە و ماوەپێشان دەدات ، بەمەشەوە رستەی شوین کەوتووی ئەندازە وپێوان وماوەدەگەیەنێتە رستەی سەرەکی لەهەردووجۆرەکا ـ نیشدا سێ فۆرمی هەیە لەرووی دروست بوونەوە . وەک : تا ، هەتا ، هەتاکوو . نموونەی بۆئەوەی ،کەئەمئامرازە رستەی شوێن کەوتوو دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی زۆرن . بۆنموونە :

مێمکە هۆلێ ی کەڵبە لەدەم

لاشەی مێردی توڕدایەچەم

بۆدۆستی نمەک بەحەرام

تا

هەردووبگەن بەمەرام ( ک، ژ ، ت ،ل، ٨٨)

لێرەدا رستەی " هەردووبگەن بەمەرام " رستەیەکی شوێن کەوتووەوبەیارمەتی ئامرازی "تا " گەیشتووتەرستەی سەرەکی ، ئەورستەیەی، کەئامرازی ناوبراو دەگەیەنێتە

رستەی سەرەکی پێی دەوترێ رستەی شوێن کەوتووی ئامانجی

بۆنموونە :

کەوتەخۆگۆڕین،

تا

مسەجەلەکەبەرێت بۆلای وەستا . (خ،ئا ،ل،٩١)

رستەی( مسجەلەکەبەرێت بۆوەستا )رستەیەکی ئامانجی یە .

ئەمویست منالم هەبێت، هەتا بەشیری ئەمبڕوایەپەروەردە-

یان کەم،

تا

ئەوەی لەمن قەوما لەوان نەقەومێتەوە . ( خ،ئا ،ک ،٤٢)

ئامرازی "تا " هەرناتوانێ بەس رستەی شوێن کەوتووی

ئامانجی بگەیەنێتە رستەی سەرەکی، بەڵکوو دەتوانێ رستەی

شوێن کەوتووی ماوەش بگەیەنێتە رستەی سەرەکی .بۆنموونە :

منیان خستەنێوان خۆیانەوە هەریەکەیان دەستێکی گرتبووم

بەناوبازار تێئەپەڕین،

تا

لەکەبابخانەکەی وەستا شەریف نزیک بووینەوە . (ئە ،ک،ل،٢٤)

رستەی (لەکەبا بخانەکەی وەستا شەریف نزیک بوویـــنـەوە)

رستەیەکی شوێنکەوتووی ماوەیەو ماوەپێشان دەدات. هـــەروا

دەتوانـــێ رستەی شوێن کەوتووی ئەندازەش بگەیەنێتە رســتەی

ســەرەکــی، بۆنمــوونــە :

قـــەدری مانـــگ نیـــە ،

تـــــا

نەگاتەشـــەو

گەرما ئـــاوی سارد ئەخـــاتەبرەو

گەلێ جار لەگەڵ ئەم ئامرازەدا پیتی (هە)دێت ودەکەوێتە

پێشەوەی. بەمەوە فۆرمی نوێ ی تا دروست دەبێ ودەبێتە "هەتا"

هەربەهەمان ئەرک و وەزیفە. بـــۆنمـــوونە :

وەستـــــا ،

هـــەتـــا

کەمێک پشـــووبـــدات . ( خ،ئا ، ک ، ٤١ )

پێم مەڵێن ریشت وەک خوری خاوە ،

کوێـــر ،

هـــەتـــا

دەمرێ بەهیوای چاوە . ( پەند، کەریم،ل، ١١٥)
بەپەنجەرەکەوە وەکوو پێوەی نووسابێ ووشک بوو،
هەتا
ئێوارەیەکی درەنگ لەجێگای خۆی نەجوڵا. (خ،ئا ،ل،٥١)
سوار،
هەتا
نەگلێ نابێ بەسوار
برنج نەکوترێ ناچێتەبازار ( پەند،کەریم،ل، ٩٨).
لەمرستەیەدا دەبوایە ئامرازی "هەتا" بکەوتایەپێش وشەی
"سوار" بەمەوە ئامرازی "هەتا" دەتوانێ بکەوێتە پێشەوەش
بەڵام ئەمحاڵەتەلەزمانی ئەدەبیدا زۆرکەم بەرچاو دەکەوێ
چونکە بەزۆری هەردەکەوێتەناوەوە .نموونەبۆ "تا" کەفۆڕمی
"هەتا" یە :
بۆمبایەکی ئاگراوی وائەتەقێنم
کەس نەمێنێت،
تا
ناوجەرگەی ئەرز ئەسووتێنم

لەگەڵ ئەوەش ترسنۆکن قورسن بێ هێزن

بەڵام هەرگیزشەلم ،کوێرم ،دەست نا پا رێزن،( پەندکەریم ،ک،١٠٤)

جاری وا هەیە ، ئەد "تا "دووئا مرازی تروەردەگرێ وەک "هە ،

کە" دەکەوێتە پێشەوە " کو" کەدەکەوێتە دواوەی بەمەوە

( هە+ تا +کو ) هەتاکو دروست دەبێ . بۆنموونە :

گامەڕە چەپۆک گا پاڵ پێوەنان

هەتاکوئیشیان لەئیش ترازان .( پەند ،کەریم ،ل،١١١)

ئامرازی گەیەنەر" چونکە":

ئامرازی "چونکە"ش بەکێکە لەئامرازەکانی گەیەنەر ،کە

دەتوانێ رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتەرستەی سەرەکی.

بۆنموونە :

زوانی خۆت بگرە دەخیلە لەو وشانەی واحەقە

چونکە

مەشهورە ،کەحەق لای بێ تەمیز ،تاڵ وڕەقە (پەندکەریم ل،١٠٨)

ئەورستانەي کەشوێن کەوتوون وبەیارمەتی ئامرازی

گەیەنەر "چونکە" دەگەیەنەرستەی سەرەکی لەنێورستەی

لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا پێیان دەوترێت رستەی

شوێن کەوتووی هوێی . بۆنموونە :

ئەزانن بۆدەبێتەدز ، هەزار وبێکەس وبرسی؟ لە بۆ

تێربوونی زگ

چونکە

زگی برسی چنا پرسی . (پەند ،کەریم ،ل ، ٩٥)

نێرومێ هەردوو بەجووتە بۆوەتەن هەوڵێ نەدەن

دوورە دەرچوونی لەدیلی، مەل بەباڵێ نافڕێ

هەوڵی راستی هەردوولا ئامانجی میللەت سەرئەخا

چونکە

مەعلوومە بەیەک دەس چەپڵەقەت لێ نادرێ

ئامرازی "چونکە" لەناورستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو

خوازدا هەردەم جێگای ناوەراست دەگرێ ،یانی دەکەوێتە

نێوان رستەی سەرەکی ورستەی شوێن کەوتوو . بۆنموونە :

لەمچەندمانگەی دوایی یەدا ئەوەی بەدەگمەن بۆهەڵئەکە-

وت، چونکە

لەوماوەیەدا رۆژانێکی ئەوتۆی بەسەر بردبوو ، کەیا هەر

هیچی دەس نەئەکەوت ، وەیا لەسێ چوار پەنجایی تێ پەڕی

نەئەکرد. ( ک ، ژ،ت،ل ، ٦١)

بەڵامهەندی جار دەتوانێ بکەوێتەپێشەوەی رستە ، بە تایبەتی لەو حاڵەتەی ، کە رستەکە لەپارچەیەکی شیعر بوو نەک پەخشان لەبەر پێداویستی یاسای شیعر. بۆنموونە:

چونکە

خوا راستەو راستی خۆش ئەوێ

داری راست بەلای چەوتا ناتەوێ. ( پەند،کەریم،ل،٧٤)

فرمانی خەبەری هەردوو رستەکان رستەی سەرەکی ورستەی شوێن کەوتوو بەزۆری لەیەک کاتدا دەبن ، کاتەکەش بەزۆری لەرابردوو دەبێ ، بۆنموونە:

ساڵێ جارێک چاووم پێیان نەئەکەوت ،

چونکە

دەربەدەرووهەڵاتووبوون.

فرمانی یەکەم لەکاتی رابردووی بەردەوامی نەفیدایە بەڵام فرمانی دووەم لەکاتی رابردووی دووردایە .بۆنموونە:

دوێنێ شەو تادرەنگ وەختێک خەونەچووەچاووم.

چونکە

زۆر بەپەرۆشەوە چاوەروانــی ئەم سبەینێ یەم ئەکـرد .

( ک، ژ ، ت، ل، ٨٠)

باسی گەردنیش بانەکــرێ،

چونکــە

ئەگەربوترێ لەشوشەوئاوی بێ گەردیئەکرد ..

هێشــتا کــەمــە ، (خ، ئا ، ل، ٣)

لێکولێنەوەی نموونەکان واپێشانمان ئەدەن ، کەهەنــدێ جار لەبریتی ئامرازی " چونکە " ئامرازی لێکدراوی گەیەنەر "لەبەرئەوەی کە" بەکاردێت بۆنمـوونــە :

ئەوەی راستی بێ ،ئەت ووت ئەموتانەمبەچەقۆلەقــــورگ دەرئــەهێنن ! ئەمەش تــەنهــا ،

لەبــەرئــەوەی کە

ئەمەیەکەمجاربووئەمقسانەمهەڵئەدا بەگوێی

کچێکــدا . ( ک ،ژ ، ت، ل، ٨٢).

گەرهەمان رستە بەئامرازی "چونکە" بنووسین واتــاکـــەی ناگۆڕی بۆنــــموونــە :

ئەوی راستی بێ ، ئەت ووت ئەم وتانەم بــەچــەقـۆ لـــە

قــورگ دەرئەهێنن ! . ئەمەش تەنها ،

چونکــە

ئەمەیەکەمجاربووئەمقسانەمهەڵئەدا بە

گوێ ی کچێکــدا .

نموونەی ترلەســەر "چــونکە"

لای خەڵک وخوا و دراوسێ یەکان خۆشەویست بوو ،

چونکە

کاسبێکی پاک ولەخــوا تــرس بوو . (خ،ئا ،ل،٥٧)

ئامرازی گەیەنەر " ئــەگــەر " :

لەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا "ئەگەر"یش ئامرازێکی

گەیەنەرە ، دەتوانێ رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتەرستــــەی

ســەرەکــی، بــۆنمــوونە :

ئــەگـــەر

پشیلە لەماڵ نەبــێ،

مشکان تلیلیلیانە (پەند ،کەریم ،ل٤٣)

ئەگـــەر

ئەکەویەجوست وجۆی ئــەحواڵ

قسەیا لەشێت ببیەیا منـدا ڵ. ( پەند ،کەریم ،ل، ١٠٨)

ئەورستەشوێن کەوتووانەی، کەبەئامرازی "ئەگەر"دەگەیەنر - ێتە رستەی سەرەکی پێیان دەوترێت رستەی شوێن کەوتووی مەرجی. بۆنموونە :

ئـەگـەر

"توجاری حاجی، پارەبێنە "

مەتا عە نیک وبەد، دنیا دوکانـە .

بەگا ڵتەوگەپێکەوەپێموت، ئا خۆچا یەکانی ئـەمرۆشـم وەک رۆژانی تر شیرین ئەبن ؟! بەدەم زەردەخەنەونازکردنێکی دڵ فرێنەوە ووتی ! تا ،

ئەگەر

وەک جاران رەتیان نەکەیتەوە (ک، ژ،ت،ل، ٨٣)

ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر" لەزمانی کوردیدا روا ڵـەتـی تریشی هەیە ،وەک ( گەر ،مەگەر )، بۆنموونە :

ژنـی بـەدزانـە

گـەر

خۆتی لێدەی ما ڵت وێرانە ،(پەند ،کەریم ،ل، ٩٦)

ڕێوی بەفێڵ ناوەستێ،

مەگەر

تەڵەپێ ی بەستێ (ک ،ژ ،ت،ل، ٧١)

باشیش نیە ئەم قسانەئەکەم ،

ئەگەرچی

لەدڵی خۆشما بێت . ( ک،ژ ،ت ، ل، ٧١)

بەڵێ کۆڵینەوە لەمسێ ڕستانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کەفۆڕمی "گەر" لەئامرازی گەیەنەر "ئەگەر" هاتووە ، بە جیاوازی ئەوەی ،کەلە "گەر" پیتەقالبی "ئە" کەوتووەو ماوەتەوە "گەر" .لەرستەی دووەمدا ئامرازی "مە"ی نەفی کەوتۆتە پێشەوەی "گەر" وفۆرمی "مەگەر" دروست بووە ،لەهی سێیەمدا دەربڕینی یارا ناوی (چی) کەوتۆتە دوای ئامرازی "ئەگەر" وفۆڕمی ئەگەرچی دروست کردووە ، هەرسێ حاڵەتەکە لەبریتی "ئەگەر" بەکارهاتوون.

یەکێک لەخاسیەتەکانی ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر" ئەوەیە کەهەردەم دەکەوێتە پیشەوەی رستە . بۆنموونە :

ئەگەر بمانەوی لەمدنیا ولەودنیا نەبین،

ئەبێ لەیادی نەکەین . ( خ، ئا ، ل، ٢٠ ).

ئەگەر

قەڵەرەش رێ نیشاندەربێ،

ئەبێ گەورەهەردەربەدەربێ

( پەند ،کەریم ،ل، ٤٢ )

جاری واهەیە بەتایبەتی لەبەر فۆڕمی ئەدەبی یان درێژی رستە ئامرازی گەیەنەر ( ئەگەر )دەکەوێتە نێوان رستەی سەرەکی ورستەی شوێن کەوتووی مەرجی ،بۆنموونە :

بەهار بووفەسڵی زستانم ،

ئەگەر

یارم لەگەڵ بایە

درۆیە گەر وتویانە بەخونچەیەکی بەهار نایە *

( پەند ،کەریم ،ل، ١ )

ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر" خاسیەتێکی تریشی هەیە ئەوەیە ، کەزۆرجار لەگەڵ فرمانی خەبەری هەردووڕستەکان سەرەکی وشوێن کەوتوو ،کە فرمانێکی ئەسڵی یە ، فرمانێکی یارمەتی دەریش دێت . بۆنموونە :

---

* - ئەم شیعرە لە نێو شیعرەکانی مامۆستا هێمن دا دەبینرێ .

ئەگەر

ئەیەوێ پێی بکا ،

ئەبێ بژی

ئەگەر

بمانەوێ لەمدنیا ولەودونیا نەبین،

ئەبێ لەیادی نەکەین (خ،ئا ،ل،٢٥)

ئامرازی گەیەنەر "بۆیە":

ئەمئامرازە ئامرازێکی گەیەنەرەو زۆربەکاردێتە بۆ نموونە:

مامپۆلیس وادیار بووگوێی لەدوا قسەکانی کوێخا بوو ،

بۆیە:

هاتەپێشەوەوسڵاوێکی ساردوسڕی کرد. (خ،ئا ،ل، ٢٧)

ئەمئامرازە دەتوانێ رستەی شوێن کەوتووی تەسلیمی بگەیەنێتەرستەی سەرەکی . بۆنموونە:

بالۆرەی بووک وخەسووی گوێ لێ بوو

بۆیە

کچەکەی نەئەدا بەشوو

کەچی کچ دەستی لەدایکی بەردا

مەیموون زۆرجوان بووئاو ولەشی دەردا (پەند،کەریم،ل،١٢٨)

هەتا ئەوکاتە مامۆستای وای ئەزانی ، کەئاغا ئەبێ

قەڵەوێکی وزگ زل بێ،

بۆیە

بەسورسامیەکەوە سەیری ئەمئاغا لەردی کرد.(خ،ئا ،ل،١٧)

ئەمرستەشوێن کەوتووەی ، کەبەیارمەتی ئامرازی "بۆیە"

دەگاتە رستەی سەرەکی لەرستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو

خوازدا ،ئەوخاسیەتەی ، کەفرمانی خەبەری هەردوو رستەکان

شوێن کەوتوو وسەرەکی لەیەککاتدا دەبن یالە کاتی جیا

جیا ، ح هەردووکیان لەکاتی رابردوو دەبن یالەکاتی

ئێستا ، وەیالە کاتی ئاڵوگۆر ، وەک یەکێکیان لەکاتی

ئێستاوئەوەی تریان لەکاتی رابردوو ، یان بەپێچەوانە .

بۆنموونە :

لەدوو توێ با ئدوپەڕی دڵسۆزی خۆشەویستیم روون ،

ئەبۆوەوە ،

بۆیە

ئەویش هەرکەسەری هەڵبڕی وسەرنجی دائی، ڕوومەتەکانی
هێندەی تر سوور هەڵگەڕان ،( ک ،ژ ، ت ، ل، ٨٢)
گومانم نەما ،پێم رائەبوێرێ،
بۆیە
رووم لێ گرژ کرد (خ،ئا ،ل، ٣٨)
مام پۆلیس وا دیار بوو گوێ ی لەدوا قسەکانی کوێخا بوو ،
بۆیە
هاتەپێشەوەوەسڵاویکی ساردوسڕی کرد ( خ، ئا ، ل، ٢٧)
لەم دووڕستانەدا فرمانی خەبەرەکان ،فرمانن لەکاتی
رابردوودان هەروا دەشبێ لەکاتی ئێستادا بن بۆنموونە :
کەسیش بڕوا بەمەناکا ،
بۆیە
باسی نەکرێ باشترە . (خ،ئا ، ل، ٣)
نموونە بۆکاتی لەیەک جیازۆرن، وەک :
هەوراز بڕین بۆپیادەیەکی رانەهاتە کارێکی ستەمە ،
بۆیە
لەهیلاکیا لەپەل وپۆ کەوتبووم. (خ،ئا ،ل، ٣٧).

فرمانی خەبەری رستەی سەرەکی فرمانی لکاوە لەکاتی ئێستادا "ە" ،کەبەوشەی "ستەم" لکاوە ،بەڵام فرمانی خەبەری رستەی شوێن کەوتووفرمانێکی کاتی رابردووی دوورە "کەوتبووم".

دەبێت فرمانی یەکەم رابردوو بێت وفرمانی دووەم لەکاتی ئێستادا بێت، بۆنموونە:

وادیاربوو ، مامەسەعەتاقەتی لەبێ دەنگی وداڵغەلیدان چووبوو ،

بۆیە

ئەیویست بەعەربیا نوویەکەوە بێت دەرگای قسەکردن بخاتە سەرپشت ،( خ،ئا ،ل، ٥٦).

ئەنجام

١ـ زۆرلە رێزمان نووسانی کوردوغەیری کورد لەکتێبە رێزمانیەکانیاندا شت وباەتی بەنرخیان لەبارەی ئامراز بەگشتی وئامرازی سینتاکس نووسووە ، لەگەل ئەوەشنووسینەکە لەکەموکوڕی رزگاری نەبووە .

٢ـ ئامراز لەرووی دروست بوونەوە دەکرێت بەدووبەشەوە

ئامرازی سادەولێکدراو .

٣ـ لەرستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا ،کەبەیارمەتی ئامرازی "بەڵکوو" دروست دەبێت ،دەبێ لەرستەی سەرەکیدا وشەی تەناسووبی "تەنیا ، نەوەکوو" هەبێت .

٤ـ ئامرازەکانی "وەکوو ،ئینجا" دوو ئەرک جێبەجێ دەکەن ؟ ئامرازی "وەکوو" سەرەڕای ئەرکی بەستنەوەی دوورستەبەیەکەوە ئەرکی وەکیەکیش وەدەست دەنێ ، کەلە رەوان بێژی دابەکار دێت ،یانی ئەمەئامرازی دروسکردنی وەکیەکە ـ التشبیه ـ .

٥ـ هەندی ئامراز هەن ، دەتوانن ئامرازی نەفی وەربگرن "نە" وەکوو ئامرازی سینتاکس " وەکوو" وفۆرمی "نەوەکوو" دروست دەکات .

٦ـ هەر رستەیە ،لەورستانەی، کەبەیارمەتی ئامرازی، " ئەگینا . بەیەکەوە دەبەسترێتەوە دەبێ موبتەدای تایبەتی خۆی هەبێ.

٧ـ "وە" کنیەکێکەلە ئامرازەکانی پەیوەستداری زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردی ـ دیالێکتی سۆرانی ـ،کەدەتوانی

دوورستەبەیەکەوە ببەستێتەوە .

٨- "کە" ئامرازێکی گەیەنەرەلەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ،ئەمە هێجگار باو وبلاوە وزۆر بەکاردێت دەتوانێ جۆرەها رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەکی لە نێورستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا ، بۆیە پێی دەوترێ ئامرازی گەیەنەری گشتی. ئەم ئامرازە لەرووی داهاتنیەوە لەئامرازی "کێ"ەوە هاتووەو پێشکەوتنی ئەوە لەزۆرزمانی ئێرانی بەکاردێت وەک ،فارسی وپەشتو .... هتد ، جێگای ئامرازی "کە"

پێشەوەی رستەیە لەوحالەتەی ، کەرستەی شوێن کەوتووی کاتی بگەینێتەرستەی سەرەکی ، بەلام گەر رستەی شوێن کەوتوو -ی ، کاتی بگەیەنێتەرستەی سەرەکی ،بەلام گەر رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ، جێگای هەرنێوان رستەی سەرەکی ورستەی شوێن کەوتوو دەبێت ئەم ئامرازە دەتوانێ جێگای ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر "بگرێتەوە .

٩- ئامرازی گەیەنەر "بۆئەوەی" هەردەکەوێتە نێوان رستەی سەرەکی وشوێن کەوتوو ، هەروا دەتوانێ وەزیفەی( تا ،

تا وەکوو ) بگەیەنێ.

١٠- ئامرازی "تا " دەتوانێ رستەی شوێن کەوتووی ئامانج بگەیەنێتە رستەی سەرەکی، هەروا دەشتوانێ رستەشوێن کەوتووەکانی ئەندازەیی وپێوان وماوەش بگەیەنێتە رستەی سەرەکی.

١١- ئامرازی گەیەنەر "ئەگەر" دەتوانێ ئامرازی نەفی وەربگرێت وەک ئامرازی "مە"و فۆرمی "مەگەر" دروست بکات ، یەکێک لەخاسیەتەکانی تری ئەم ئامرازە ئەوەیەکەهەردەم دەکەوێتەپێشەوەی رستە ،لەورستەلێکدراوەی شوێن کەوتووی خوازەی ، کەبەیارمەتی ئامرازی " ئەگەر " دروست دەبێت هەردوو رستەکانی - سەرەکی وشوێن کەوتوو- فرمانی خەبەرەکانیان ، کەفرمانێکی ئەسڵیە فرمانێکی یارمەتی دەریش دێت . ئەمئامرازە فۆرمی "گەر" ئەگەرچی، مەگەر"یشی هەیە .

١٢- چ ئامراز بەگشتی یان ئامرازی سینتاکسی تائێستا نەبوونەتە باسێکی سەربەخۆ .

١٣- ئەورستانەی ،کەبەیارمەتی ئامرازی(یا )بەیەکەوە ،

دەبەسترێنەوە بەزۆری رستەی یەک موبتەدایین .

١٤- ئامرازە پەیوەستدارەکان لەرووی ئەرکی خۆیانەوە هەندێکیان دەکرێن بەچوار بەشەوە ، وەک : و ،ش ، بەڵام ،یا ، ئەوسا ، بەشی بەیەکەوە بەستنەوە ، عەتف ، جیاکەرەوەو هامبەری.

١٥- ئەورستەیەی ، کەبەیارمەتی فاریزە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە ،فرمانەکانیان بەزۆری لەیەک کاتدا دەبن، چ هەردووکیان لەکاتی ئێستا دەبن یان لەکاتی رابردوو .

١٦- شوێنی ئامرازی گەیەنەر "کەچی" هەرنێوان رستەی سەرەکی ورستەی شوێن کەوتووەلەناو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا .

١٧- لەرستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا فرمانی خەبەری هەردوو رستان - سەرەکی وشوێن کەوتوو- ،کەبە یارمەتی ئامرازی "چونکە"ی گەیەنەر دەگەیەنە یەکتر لە یەک کاتدا دەبن.

## کورتکراوەکان

ل = لاپەڕە

خ ـ ئا ـ خۆری ئاوابوو

ئە ـ ل ،= ئەلەمان کوردی

پەند ـ کەریم .= پەندی پێشنیان لەشێعری کوردیدا ، کەریم شارەزا بەغدا ١٩٧٦،

ک ـ ژ ـ ت ،= کلاوەیەک ژانی تووو ـ حوسێن عارف ١٩٧١

## سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوەبەزمانی کوردی

١- سەعید سدقی کابان ، مختصر صرف ونحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨، ٢- لیژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ،بدغدا ١٩٧٦

٣-محەممەدئەمین هەورامانی ، سەرەتایێک لەفیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٢،

٤- نوری عەلی ئەمین رێزمانی کوردی ،سلێمانی ، ١٩٦٠،

٥- ئەحمەدحەسەن ئەحمەد ،رێزمانی کوردی ،بەغدا ١٩٧٦

٦- جگەرخوێن ، آوا ئودەستورا زمانی کوردی ،بەغدا ١٩٦١

٧- دکتۆرئیبراهیم عەزیزئیبراهیم ، رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خواز لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەغدا ،١٩٨٠

٨- تۆفیق وەهبی ، پیتەقالبی "ئە"ی شێوەی سلێمانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگ (١)بەشی ل(٩)،

٩- قەناتی کوردۆ - زمانی کوردی - رێزمان ، پەریفان ١٩٧٥،

١٠- دکتۆر ئاورەحمانی حاجی مارف ، رێزمانی کوردی

مۆرفۆلۆژی ـ بەشی یەکەم ـ ناو ـ بەغدا ، ۱۹۷۹

۱۱ـ تۆفیق وەهبی ،خوێندەواری باو ،بەغدا ،۱۹۲۲،

۱۲ـ د ،جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبیرگ، ۱۹۷۶،

۱۳ـ عەبدوڵڵا نەقشبەندی، پاشکۆی (درا )، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگ (۱) ،ژمارە ، (۱) ،بەغدا ، ۱۹۷۲ ،ل ۱۱۵ ـ ۱۲۷،

۱۴ـ عەلائەدین سەجادی ،دەستوور وفەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ،فارسی، بەغدا ،۱۹۶۲،

۱۵ـ د،کەمال فوئاد چەند سەرنجێکی زمانەوانی،گۆڤاری رۆژی کوردستان ، ژمارە (۲) بەغدا ۱۹۷۱ ،ل،۵۸ـ ۵۹

۱۶ـ کوردستان موکریانی ،ئامرازەکانی خستنەسەرلەزمانی کوردیدا ،گۆڤاری زانکۆ ، بەرگ(۴) ،ژمارە (۱) ،سلێمانی ، ۱۹۷۸، ل ۱۴۵ ـ ۱۷۴،

۱۷ـ کوردستان موکریانی ،رستەی زمانی کوردی،گۆڤاری زانکۆ ،

۱۸ـ د ـ کوردستان موکریانی و د ـ نەسرین محەممەد فەخری

رێزمانی کوردی بۆپۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی بەغدا ١٩٨٢

١٩- محەممەدئەمین هەورامانی ،زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوەردا بەغدا ١٩٨١٠

٢٠- مەسعوود محەممەد ،چەند حەشارگەیەکی رێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦

٢١- د ، نەسرین محەممەد فەخری ،پەرەسەندنی واتای، وشەو دەوری لەدوکەمەند کردنی زماندا ، گۆڤاری "الاستاذ" ژمارە (٢) بەغدا ،١٩٧٨- ١٩٧٩- ل، ٦٤٢- ٦٧١

٢٢- چاوگی بێ واتا لەزمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٣

٢٣- نوری عەلی ئەمین ،رێزمانی کوردی، سلێمانی،١٩٦٠

٢٤- وردی ،دەستووری زمانی کوردی، گۆڤاری، گرۆگالی منداڵی کورد، ژمارە (٦) حوزەیران، ١٩٤٦- ل ٣

٢٥- دکتۆر ئیبراهیم عەزیزئیبراهیم، حاڵەتەکانی جنس وبینای بەرکارلەزازادا وەرگێرانی لەروسیەوە ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (٥)بەغدا ١٩٧٧ل ٢٣٦- ٢٦٣

٢٦- صالح حسێن بشدری . کورتە یەک لەرێزمانی کوردی بەغدا ١٩٨٥٠

دووەم : سەرچاوە بەزمانی عەرەبی

٢٧- توفيق وهبی، قواعداللغةالكرديه ، الجزء الاول ،البا
- ب الثانی، بەغدا ١٩٥٦،

٢٨- مالک يوسف المطلبی ،فی التركيب اللغوی للشعـر
العراقی المعاصر- دراسەلغويه - بەغدا ١٩٨١،

٢٩- الدكتور عفيف دمشقيه ، مطئ متعره علی الطريق
تجديدا لنحوالعربی ، بيروت ١٩٨٠.

٣٠- الدكتور اميل بديع يعقوب ،فقەاللغةالعربيه و
خصائصها ،بيروت ١٩٨٢ .

٣١- الدكتورامين علی السيد ، فی علم النحو ،الجزء الاول ،
الطبعەالثانيه ، مصر ١٩٧٥ .

٣٢- الدكتورامين علی السيد ، فی علم النحو
الجزء الثانی ،الطبعەالثانيه ، دارالمعارف بمصر (بلا).

٣٣- عباس حسن ،النحوالوافی ، الجزء الاول،الطبعەالخامسة
دارالمعارف بمصر ( بلا ).

٣٤- محمد احمدبرانتی ، النحوالمنهجی، الطبعةالثانيه
(بلا) ١٩٥٩ .

٣٥- الدكتور مهدی المفزومی ،فی النحوالعربی ، ( نقدو توجیه ) ، الطبقهالاولی ،بیروت ١٩٦٤،

٣٦- الدكتور شوق طيف ، المدا يرالنحويه ، الطبقهالثانيه القاهره ، ١٩٧٢ .

٣٧- توفيق وهبی قوا عداللغةالكرديه ،الجزء الاول، الباب الاول ،بهغدا ١٩٥٦ .

٣٨- الدكتور عبدالنعيممحمد حسين ، قواعداللغه الفارسيه ، مصر، ١٩٧٥ .

سێیەم.سەرچاوە بەزمانی فارسی :

٣٩- مصطفی خرم دل ، صرف دستور زبان کردی - سورانی تبریز ١٣٤٧ ک .

چوارەم ،سەرچاوە بەزمانی رووس :

٤٠- کوردۆیێف ک ،ک رێزمانی زمانی کوردی، مۆسکۆ لێنینگراد ،١٩٥٦.

٤١- کوردویێف ک ،ک ،فەرهەنگی کوردی - روسی ، کورتە باسێکی رێزمانی زمانی کوردی مۆسکۆ ١٩٦٠.

٤٢- کوردۆیێف ک ، ک ،رێزمانی زمانی کوردی بەکەرستەی دیالێکتەکانی کرمانجی وسۆرانی مۆسکۆ ، ١٩٧٨.

٤٣- بەکاییێف چخ، زمانی کوردەکانی ئازەربایجان مۆسکۆ ١٩٦٥.

٤٤- بەکاییێف چخ زمانی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەت مۆسکۆ ١٩٧٣،

٤٥- میسر بی.ک ،ر، سمیرنۆڤەی ، ئا ، دیالێکتی کوردی موکری لێنینگراد ١٩٦٨،

٤٦- ئیبراهیم ،ع،ئی، رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز

لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لەدیالێکتە ،
ناودیەگانی زمانی کوردیدا ، مۆسکو ۱۹۷۵ ( نامەی دکتۆرا )

۴۷- ڕۆبنیچک یو ،ئا ، پریرۆداو وەزیفەی ئامرازی
گەیەنەری فارسی (کە ) کورتە هەوالەکانی ئامۆژگاری ڕۆژهە-
ڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤیەت ، مۆسکۆ ۱۹۵۹
نمرە ( ۳۶ ).

۴۸- رۆبینچک یو ،ئا ،رستە ئاوێتەکان لەگەڵ رستەشوێن
کەوتووەدیارخەرریەکان لەزمانی ئیمڕۆی فارسیدا ، مۆسکۆ
۱۹۵۹ .

۴۹- کالێنینە ز، م. رستەی لێکدراوەی شوێن کەوتووخواز
لەزمانی ئەدەبی ئیمڕۆی پوشتودا ،مۆسکۆ ۱۹۶۶ .

۵۰- تۆکرمان ی، ی، لێکولێنەوەیەک لەرێزمانی کوردیدا
مۆسکۆ ۱۹۶۲.

پێنجەم : سەرچاوەبەزمانی ئینگلیزی

۵۱- Mackenzie D.N. Kurdish dialect studies ( London, 1961-1-

۵۲- Macarue E.N. A Kurdish grammar
New. york 1958

## سەرچاوە نموونەکـــان

١ـ دکتۆر مارف خەزنەدار ، ئەلەمان کوردی ، بـەغدا ١٩٦٩

٢ـ دکتـۆر کـاوس قەفتان ، خـۆری ئاوابوو ،سلێمانی١٩٧٠

٣ـ حوسێنی عارف،کلاٚفەیەک ژانی تووڕە ،نەجەف، ١٩٧١.

٤ـ کـەریم رەزا ، پەندی پێشینان لەشێعـری کـوردیدا

بـەغـدا ، ١٩٧٦ .

( ناوەرۆك )

## بەرهەمەکانی دانەر

بەرهەمی لەچاپدراو :

١- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ،بەغدا ، ١٩٧٦ ( لەگەڵ لیژنەی زمان زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد )

٢- ئەلف وبێ کوردی بۆ مەعاهیدی مامۆستایان ، بەغدا ١٩٧٨ ( لەگەڵ چەندما مۆستایەک بەتەکلیفی وەزارتی پەروەردە )

٣- هەندێ ئامرازی سینتاکسی لەزمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا - بەرگی سێیەم بەغدا ١٩٨٠.

٤- رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لەدیالێکتەنا ودیەکانی زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٥- لێکۆڵینەوەیەک بەناونیشانی " دەربارەی سینتاکسی زمانی کوردی"گۆواری ڕۆشنبیری نوێ،ژمارە (٥٢) ئابی ، ١٩٧٦.

٦- حاڵەتەکانی جنس وبیناى بەرکارلەزازادا ، وەرگێڕانی لەرووسیەوە گۆواری کۆڕی زانیاری کورد ژمارە (٥)ساڵی ١٩٧٧

٧- لێکۆڵینەوەیەک بەناونیشانی " ئامرازی گەیەنەر ( کە ) لەزمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا " گۆواری رۆژی کوردستان ژمارە (٥٨) ساڵی ١٩٨٠( دەقی ئەم لێکۆڵینەوەیە

لەیەکەم کۆڕی وەرزی دووەمی رۆشنبیری کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لەئێوارەی ١٢/٣/ ١٩٨٠ لەهۆڵی کۆمەڵە خوێندرایەوە بەناوی ( کۆڕی زانستی زمانی کوردی)

٨- گیروگرفتی نووسینی فرمان ورناوی لکاولە رووی پێکەوەنووسان وپێکەوە نەنووسانەوە ، گۆواری کۆڕی زانیاری عێراق ،دەستەی کورد- بەرگی نۆیەم .

٩- هەندێ لایەنی وێکچوون لەنێوان دیالێکتی زازاو دیالێکتی سۆرانی گۆواری رۆشنبیری نوێ ژمارە ( — )ساڵی ١٩٨٨ .

١٠- وتارێک بەناونیشانی نووسینی پیتی (ر) بەگرافیکای عەرەبی لەزمانی کوردیدا - گۆواری رۆژی کوردستان ژمارە (٥٧) ساڵی ١٩٨٠ .

ئامراز لەزمانی کوردیدا ( ئەمکتێبە )

١- چاوک سادە میحوەرێکە بۆدروستکردنی چاوگی نوێ لەزمانی کوردیدا ،گۆواری کاروان ١٩٨٦.

بەرهەمی ئامادەبۆچاپ :

١- زانستی زمان وەرگێران لەعەرەبیەوە لەگەڵ زیاد

کردن وختنەسەر .

٢- راناوی ناوی دیارخراو لەگۆڤەرەکانی دیالێکتی ناوەندی زمانی کوردیدا دراوە بەکۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد .

٣- اداۃ الوصل (کە) فی اللغة الاربعة الکردیة المعاصرە ، ( بحث باللغة العربیة ) دراوەبەکۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد .

٤- من اجل ان تسیر الکتابة الکردیة وطریقها الصحیح )بحث باللغة العربیّة ) .

٥- باسە زمانیەکان لەرۆشنبیری کوردیدا ،

کاری لەبەردەست :

فەرهەنگی گیرفانی کوردی - رووسی - رووسی ،کوردی

هەندێ وتاری ئەدەبی بەناونیشانی " رازی تەنیایی)

- لێکولێنەلەزمانی کوردیدا .

- چەند لایەنێکی زمانی کوردی

بەرهەمی تەواو بۆبەشی کوردی زانکۆی سەلاحەدین بەناوی موحازەرات .

١ـ رێزمانی زمانی کوردی پۆلی یەکەم:

٢ـ " " " " دووەم لەگەل چەند تێبینیەک.

٣ـ " " " " چوارەم.

٤ـ دیالێکتەکانی زمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەم

٥ـ رێزمانی زمانی کوردی پۆلی سێیەم